

# دەستی پەروەردگار

(٤)

نووسینی محمود شیت خطاب

ئامادەکردنی حبیب محمد سعید


منتدى إقرأ الثقافي

# دەستی پەروەردگار

## (٤)


نووسینی

محمود شیت خطاب

ئامادەکردنی

حبیب محمد سعید



چاپخانەی ئیرشاد - بەغداد

سالی ١٤٠٦ک

# پێشکەش

**پێشکەش بێت :**

- بەو دڵە پاکانەی کە بە دڵ و بە گیان ، بە سەر و بە ماڵ ، بە شەو و بە رۆژ ، لە خۆشیی و ناخۆشیدا ، ڕێبازە بێگەردەکەی پێغەمبەری خوا ـ صلى الله عليه وسلم ـ بە بێوچان بڵاو ئەکەنەوە ..

- بەو مێشکە پاکانەی کە بە نووری قورئان زاخاو دراون و لە هەموو کارێکیانا پشت بە خوا ئەبەستن و هەر بە تەمای دەستی پڕ دەسەڵاتی ئەون ، فریای کۆمەڵی خواناسی سەرزەویی بکەوێ ..

# پێشەکیی

الحمد لله رب العالمین • والصلاة والسلام على سيد المرسلين محمد وعلى آله وصحبه أجمعين ••

سوپاس بۆ خوای گەورە کە ماوەی دا ، تا ئەم چوار چیرۆکەی پەڕاوی « تدابير القدر » ، بە دەستکارییەکی ویژەیی کەمەوە پێشکەش بە خوشك و برا موسڵمانەکانمان بکەین و بیان خەینە گەڵ چیرۆکەکانی تری پێشەوە ••

سوپاس بۆ خوا لە سەر بەخشینی ئیمان •• ئەو ئیمانەی کە چوە هەر دڵێکەوە ، ئەوکاتە هێلانەی خۆشەویستیی و چاکەویستیی و وەفاداریی ••

سوپاس بۆ خوا کە یاسایەکی ڕێك و پێکی نەخشە کێشاوە بۆ تۆڵەسەندن و سزادانی خراپویستانو پاداشتدانەوە و بە هاناوە هاتنی بێتاوانان •

سوپاس بۆ خوا ، دیارە دڵە موسڵمانەکان هۆشیار ئەبنەوە •• ئاگادار ئەبنەوە لە خەوی غەفڵەت ، کە

ماوەیەکی زۆر بوو جیهانی ئیسلامیی پێیەوە ئەتلایەوە ‎‌‌‎‌‎‌‎.. دیارە رۆڵەی موسڵمان غیرەتی ئەجووڵێ ، کاتێ دەستی زۆر و زەبەندە ئەبینێ ، خەریکی هەڵکێشانی نەمامی ئیمان لە نێو دڵی ئادەمیەکانا . هەر یەکە بە جۆرێك دوژمنانی مرۆڤایەتیی نەخشەی وێرانکاریی بۆ ئەکێشن ، بۆیە وا بە دڵ و بە گیان باوەش بە قورئان و سوننەتی پاك و بێ گەردی پێغەمبەری خوادا ئەکات و ئەزانێ هەرچی وا لە دەوروبەریا و قوڕئان نەخشەی نەکێشاوە هەر هەمووی دژی رەوشت و پەروەردەی راستەقینەیە .. وە بۆیە وا دەست ئەداتە خوێندنەوەی ئەو پەڕاوانەی کە خزمەتی رێبازەکەی ئەکەن ..

هیوادارم هەموو رۆڵەیەك بەم شێوە مەردانەیە ئاوڕبداتەوە بە لای رێبازی سەربەرزیی هەردوو جیهانەوە ..

وەرگێڕ
سیروان
٥ی/موحەڕڕەم/١٤٠٦

## ١ ر

لـه ناو کۆمەڵ و دەور و بەرێکدا پێ ئەچێ ، کە پیشەی دزیی و جەردەیی و تاڵان و کوشت و بڕ بوو .. ئەوانەی دەور و پشتی کاریان ڕێبڕیین بوو .. خەڵکیان ڕووت ئەکردەوە .. سامان و ئاژەڵیان بـە تاڵان ئەبرد .. ترس و لـەرزیـان ئـەخسته دڵی مرۆڤـە بێوەیی و بێتاوانەکانەوە . هەر کاتێ کەسێکیان تاڵان بکردایە و ڕووتیان بکردایەتەوە ، ئەگەر ترسـی ئاشـکرا بوون و تۆڵەسەندنیان ببوایە ، لە جێی خۆیا ئەیان کوشتەوە .

ئەمیش گـەنجێـکی ورد و زیرەك بوو ، دەور و بەریشی پیشەی ئەوە بوو کە باسمان کرد ؛ بۆیە هەموو دەمێ ئەچوو لەو کۆڕانەدا دا ئەنیشت ، کە باسی دزیی و جەردەیی و پیاوکوشتیان ئەکرد .. زۆر بە وردیی گوێی بۆ ئەگرتن ، وای ئەزانی توانا و لێهاتـەکانی مرۆڤ تەنها بۆ ئەوە ئەشێن ، بۆ ئەو کارانە بیانخاتـە

کار ؛ چونکە گوێی لــە وتەکانیان ئەبوو چۆن خۆیــان هــەڵ ئەکێشا و خۆیان بــە پاڵــەوان و کردەوەکانیــان پاڵــەوانانــە ، ئەدایــە قەڵــەم ، وە کەسانی تریش ئــەو جۆرانەیان زۆر بە ئازا و لێهاتوو ئەژمارد و رێزێــکی زۆریان بۆ دا ئەنان • دز و جەردەکانیش ، چونکە لــە کۆمەڵێــکی ئــاوەهادا ئەژیان ، کە بە هیــچ شــێوەیەك شەرمەزاری بۆ کارەکــەیان دا نەئــەنا ، ئەوەندە فیــز و کەشخەیان ئەکرد و شانازیان پێوە ئەکرد ، سەربەرزدان و ســـەرخـۆش بوو بوون و بەو ئــافەرین و رێزە ، گەیشتبوونە ئەو رادەیە وەها بیر بکەنەوە کە بە نەمریی لــە سەر ئەم زەوییە ئەمێننەوە و ئەم ژیانەیان هــەرگیز کۆتایی بۆ نیە و بە هەر کارێ هەڵسن ، لــە دوا رۆژا ، لێپرسینەوەیەکیان نیــە ••

کوڕی گــەنج تــەمەنی گەیشــتە بیســت ســاڵان ، گەیشتە ئەو تەمەنە کە ساڵەهای ساڵە ئاواتی بۆ ئەخوازێ ، بێ گانێ ، تا بۆ ئەوە بشێ ببێتە ئەندامێکی کارامەی گورج و گۆڵ لە دەستەی رێبڕاندا •• ماوەیەك بوو گوێی بۆ

باسەکانیان ئەگرت و زۆریش بە لایەوە تامەزرۆ بوون و ئاواتە خواز بوو وای لێ بێت ، ئەویش بتوانێ بەو کارانە هەڵسێ و لەو دەستکەوتانە بەشی هەبێ ، بە تایبەتیی دوای ئەوەی بە هەندێ تاقی‌کاریی بچووکدا ، لە دزیی و دەستوەشاندن ، تێ پەڕیی بوو ، کە رۆژ بە رۆژ و جار لە دوای جار ، گەورەتری ئەکردن ، تا وای لێ هات بووە دزێکی لێزان ..

بە تەواوەتیی لەگەڵ دز و جەردە کۆنەکاندا دەستی تێکەڵ کرد .. ئەوانەی کە لە بەر چاویا خۆیان کردبووە پاڵەوانێکی لێهاتوو و هەمیشە لیکی دەمیان وشك نەئەبوویەوە بۆ دەست‌خستنی پارەی حەرام ..

چەند ساڵێك لەگەڵ دەستەی رێبڕاندا هەڵس و نیشتی کرد . جا چونکە خاوەنی چالاکی و لێهاتن بوو ، ساڵ بە ساڵ لە ناویانا پلەی بەرز ئەبوویەوە و نەخشەی بۆ ئەکێشان و ئەوانیش بە گوێڕایەڵیەوە جێبەجێیان ئەکرد ، تا وای لێ هات بووە سەرۆکی دەستەکەی و لە کاتێکا دەستیان ئەوەشاند لە خەڵکیی ، ئەو دەستیشی

ئەوەشاند لە هاوەڵانی ، تا هەمیشە خۆی بەشی شێری بەر کەوێ لـە دەستکەوت و تاڵانیەکانا !!

بەڵێ ، ئەو کۆمەڵەی کە لە بەر چاوی ئەژا بوو ، هەر ئەوەندەی پیشان دا بوو .. چونکە زۆربەی ئەوانەی کە زیرەك و لێهاتوو و بە توانان ، لە سایەی کۆمەڵـی نافامدا ، تیا ئەچن .. رەوشـتی نزم و سووك ئەگرنـە بـەر .. بـە کاری زیانبەخش تەمەنیان ئەبەنە سـەر .

هـەر کۆمەڵێ دەنگی « لا الـه الا اللـه »ی بـە تێگەیشتنەوە تیا نەبوو ، ئەندامە بە کار و لێ زانەکانـی زیاتر تیا ئەچن .. هەموو بە کاریی و لێزانینێکیان بۆ نەفامیی بەخت ئەکەن .. لە جیاتیی ئەوەی ژیانی خۆیان و کەسانی تر پڕ بکەن لە بەختەوەریی ، بە پێچەوانەوە ، پڕی ئەکەن لە بەدبەختیی و مەینەت و هەناسە ساردیی .. رێبڕی گەنج و لێهاتوو ، هەر هاوەڵێکی سەری بکردایە بەقەد گوێزێك ، سەری ئەخوارد .. ئەبوایە هـەموان مل کەچی بوونایە و چاوەڕوانی دەستی ئەویان بکردایە ، شتێکیان بەش بدا ..

لە راستیشدا هەر وایە ، ئەوانەی خرایان لـە بیـر ئەچێتەوە و دەست ئەدەنە ستەم و ناڕەوایی ، دەروونیان وا سەر کەش ئەبێ داواکانیان ـ خەڵك بزانێ و نەزانێ ـ بریتین لە داواکردنی خوایەتیی ! •

ئەبێ هەر خۆی ناوی هەبێ ، ئەوەی هەبێ ، ئەبێ بۆ ئەو و بە ناوی ئەوەوە و لە پێناوی ئەوا ، کار بکا • بەم شێوەیە پارە و سامانێکی زۆری ، بە حەرامی •• بـە دزیی •• بە جەردەیی •• بە ڕێبڕین •• بە کوشتن •• بە پێ بڕینەوەی هاوەڵانی ، پێکەوە نا ، بەڵام لـە هەمان کاتا ، لە سەر مێزی عارەق و قومـارا پـەرت و بڵاوی کردەوە • چونکە دیارە پارەی حەرام ، ئەبێ هەر بۆ حەرام خەرج بکرێ و جگە لە تاوان و وێرانییش هیچی لە دوا بە جێ نامێنێ ••

۲

خەریکی ئەم بەزمانەی بوو ، پارە پەیدا کردن بـە حەرامیی و بەخت کردنی لە پێناوی حەرامدا ، تا ئـەوە بوو زانیی یەکێ لـە بازرگانە گەورەکانی مـەڕوماڵات

کە خەڵکی مووسڵ بوو ، هاتۆتە شارەکەی ئێوانەوە ( شاری حەڵەب ) و چەند رانە مەڕ و مانگا و ڕشتری پێیە ، هێناونی تا لە حەڵەبدا بیانفرۆشێ ، وە وا لە یەکێ لە خانەکاندا دابەزیوە بۆ خەوتن و حەسانەوە ..
ئەمەش لە سەردەمی عوثمانییەکاندا کە ئەو کاتە خانەکان دەوری ئوتێلی ئەم رۆژەیان ئەبینی .

یەکێك لە ئەندامانی دەستەکەی کردە چاودێر و جاسووس بە سەر بازرگانی مووسڵییەوە تا ئاگای لە هەموو هەڵس و کەوتێکی بێت . ئەوێش سەعات لە دوای سەعات هەموو هەواڵێکی بە سەرۆکی دەستە ئەگەیاند .

ڕۆژ بوویەوە و بازرگان لەگەڵ شوانەکانیا ئاژەڵەکانی دایە بەر و بەرەو بازاڕی ئاژەڵ فرۆشتنی حەڵەب کەوتنە ڕێ ، تا لەوێ بیان فرۆشێ بە بازرگانی جوملە فرۆشیی ، خوا وای هێنایە پێشەوە بە ئاسانی بۆی فرۆشران و پێش خۆرئاوا بوون تەواوی کردن وپارەکەی بە حازر وەرگرت و خستیە باخەڵی و لەگەڵ شوانەکانا بەرەو شوێنی حەسانەوەیان لە خان کەوتنە ڕێ ..

بازرگانەکە پارەکەی خستبووە ناو خورجێکەوە لە سەر ئەو ئێسترەی کە سواری بوو بوو •• شوانەکانی و ئەوانەی کە لەگەڵ خۆیا هێنابوونی ، بە دەوریا بوون• ئەمانە لـە یەکێ لە هۆزە بیابانشینەکن بوون و بە کرێ هاتبوون لە گەلیا بۆ لەوەڕاندن و بەخێوکردنی رانە مەڕ و ماڵ و وشترەکان و پاراستنی بازرگانەکە و هاوەڵەکانی ئەم سەر و لەو سەردا •• لە کاتێکا بازرگانەکە لە بازاڕی تازەی فرۆشتنی حەڵەبەوە ـ کە ئەکەوتە قەراغی شارەوە ـ بەرە و خان ـ کە ئەکەوتە ناو جەرگەی شارەوە ـ ئەگەڕایەوە ، سەرۆکی دەستەی جەردەکان لەگەڵ کۆمەڵێکیانا بۆی دانیشتن و کۆمەڵەکەی تریش بە نهێنیی و لـە نزیکەوە چاودێریان ئەکرد •

ئەوە بوو گەیشتنە ئەو دۆڵەی کە دزەکان خۆیا یان تیا حەشار دابوو کە نزیکیان کەوتنەوە ، دەستەی دزان نرکاندیان بە سەریانا و ئێستری بازرگانەکە سڵەمیەوە و بازرگانی خستە خوارەوە • ئەوەندە خراپ ڕاچڵەکیی و ئێشی پێ گەیشت ، بێهۆشیەکی هات بـە سەرا تـا

چاوی کردەوە و هۆشی هاتەوە بە بەرا ، سەیری کرد وا سەرۆکی ڕێبڕان دەستی لەیادۆتە خورجەکە و دوای ئەوەش هەڵمەتی دازە و خۆی داوە بە سەر سنگیا و خەنجەری لێ دەر هێناوە •

لە هەمان کاتا دەستەکەی بە ڕاست و چەپا شوان و پاسەوانەکانیان تەفروتوونا کردووە و زۆربەیان لە ترسانا ڕایان کردووە و هەندێکیان زامدار بوون و هەندێکی تریشیان کوژراون • دەستەی جەردە کۆمەڵی بازرگانیان تەفر و توونا کرد ••

سەرۆکی دەستەش وا بە سەر سنگی بازرگانەوە و خەنجەریش بە دەستیەوە •• بازرگان هاوار و دادی زۆری کرد ، بەڵام کەسێ نەبوو بگاتە فریای •• زۆر پاڕایەوە لە سەرۆکی دەستەکە و بە ترس و لەرز و هەناسە بڕکێوە و بە قسەی پچڕ پچڕ لێی پاڕایەوە : هەموو پارەکە بۆ ئەو بە مەرجێ نەیکوژێ • هەر ئەم پاڕایەوە و دزی بێویژدانیش دەستی لە کارا بوو و خەنجەری ئەوەشاند ، لە خەنجەر وەشاندن نەکەوت و

خوێنیش له زامەکانی دەر ئەپەڕیی هەتا بازرگان ، بە زا و هاوار و لاڵەوە ، گیانی دەر چوو .. لەو کاتەدا بازرگان هەواری ئەکرد و ئەلالایەوە ، بە ڕاست و بە چەپدا سەیری ئەکرد ، تا بەڵکو کەسێ ببینێ و هاواری لێ بکا و بگاتە فریای .. بەڵام کەسی نەکەوتە بەر چاو .. سەیری کرد ئەو درەختەی ئەو لە ژێریا خەنجەری لێ ئەدرێ ، دوو کۆتری وان بە سەرەوە .. بە حاڵ هەناسەی ئەدا ، خەریك بوو گیانی دەر چێ .. ڕووی کردە جووتە کۆترەکە و کە زانی لەوان زیاتر هیچ زیندەوەرێکی سەر زەویی بە چاوەوە نیە پێی وتن :
« جووتە کۆترەکە ، بە شاهێد بن ! » ..

هەر دووکی کردنە شاهێد چونکە لەوان بەو لاوە کەسی دەست نەئەکەوت ..

پیاوە موسڵمان بو ، بە دەروونی خواناسی ئەمەی بۆ هات ، بۆ ئەوەی جووتە کۆترەکە بکاتە شاهێد ، تا بەڵکو ، بە یارمەتیی خوا ، خوێنەکەی نەفەوتێ . بۆچ بۆ فەرمان و ویستی خوا گرانە ؟

دووره جووتێ کۆتر شاهێدیی لە سەر بدەن ؟

ئەی بە فەرمانی خوا ، لە رۆژی قیامەتـا ، هەموو ئەندامێکی ئادەمیزاد ، هەتا پێستی لاشەی ، نایەتە وەڵام ؟!

جەردەی خوێنڕێژ کە وتەی لە دەمی بازرگان بیست و کە بینی وا گیانیشی ، بێناز و بێوەسیەت ، دەر چوو ، دایە قاقای پێکەنینێکی گەورە و بە فیزێکەوە دووبارەی کردەوە :

« جووتە کۆترەکە بە شاهێد بن ! » پارەی ناو خورجی دەر هێنا و بە دەم قاقای پێکەنین و زەردەخەنەوە کەوتە رێ وەك قسەیەکی نەستەقی بێوێنەی بیستبێ ..

منداڵ و کەسوکاری بازرگانی موسڵیی ، چاوەڕوانی گەڕانەوەی باوك و بەخێرکەریان بوون لە گەشتە بازرگانیەکەی ..

دیار نەبوو .. هەر چاوەڕوانیان کرد ، بەڵام بێهوودە بوو .. کوڕی گەورە لە موسڵەوە بەرەو

شاری حەڵەب کەوتە ڕێ ، بۆ هەواڵ زانینی باوکی • کە
گەیشتە ئەوێ ، پێی وترا کە : باوکی لە فلانە خان دا
بەزیوە و ، مەڕ و ماڵاتەکەی لە فلانە ڕۆژدا فرۆشتووە
و ، هەر لەو ڕۆژەشدا بە کوژراویی دۆزراوەتەوە و ،
لە گۆڕستانی غەریباندا نێژراوە ، و ئەو کەسەی کە
کوشتوویەتی و پارە و سامانەکەی تالان کردووە ،
نەناسراوە •

**خۆی گەیاندە لای والیی •• لای قازیی •• لای**
ناسراو و نەناسراو ، هەموویان یەك وەڵامیان ئەدایەوە :
جەردەی پیاو کوژ نەناسراوە ! کوڕە ماوەیەکی زۆر
هەوڵی دا ، هەوڵێکی زۆر ، تا لە نهێنیی کوژرانی باوکی
ئاگادار بێ ، کەچی بێ هوودە بوو •• ناچار گەڕایەوە
بۆ مووسڵ و لەوێش داوای یارمەتیی لە والیی و لە قازیی
کرد ، ئەوانیش نووسراویان ناردە لای والیی و قازیی
حەلەب و هەمان وەڵامیان بۆ هاتەوە •

بەم شێوەیە خوێنی بازرگانی مووسڵیی لە بەر
چاو دادگای زەویدا ، کەوتە پێچ و ، بێسەر و شوێن

رۆی ، لە بەر ئەوە منالْ و کەس و کارەکەی ناچار بوون دەستی لێ بشۆن و ، دانیشن بۆ سەرخۆشیی لێ کـردن و ، تۆڵە سەندنی بدەنە دەست خوا •

## ٣

دوای کوژرانی بازرگان ، سـالان تێ پەڕیین •• چەند جار والیی و قازیی حەلەب گۆڕان •• دەنـگ و باسی کوشتن و تالان کردنی بازرگان لە یادی خـەلکیی چۆوە • بەلام تاقە کەسێك هەر لە یادی بوو ، شـێوە و دیمـەنی جار و بار ئـەهاتـەوە پێش چاوی ، ئـەویش سەرۆکی دەستەی رێبڕان بوو •• باسەکەی هەر لـە بیر بوو ، بە تایبەتیی کاتێ کە کۆتری بە هەڵفڕیویـی یان بە سەر درەختەوە بدیایە • خۆ ئەگەر رێك بکەوتایە دوو کۆتری پێکەوە بدیایـە و بـە سـەر دارێـکەوە وت و وێژیـان بـکردایـە ئـەوا تارمـایی بازرگانـە کوژراوەکەی ئەهاتەوە پێش چاو ، کە بانگی ئەکـرد :

« جووتە کۆترەکە ••• بە شاهێد بن !»

تاوان‌باران ، هەر هـەموویان ، هـەرچەندە لـــە

خرابەدا رۆچوو بن و تاوانی زۆریان کربێ و دڵیان رەش بووبێتەوە ، هەمیشە لە ژیانێکی پڕ لـە ئازار و مەینەتـا نەژین .. بە تایبەتیی تاوانی کوشتن ، لە یاد ناچێتـەوە و خێرا خێرا ویژدانیان ، وەك دەرزی پیا بچەقێ ، ئازار ئەدرێت .. ناحەسێنەوە .. ئارام ناکرن .. تامی خۆشیی ژیان ناکەن .. دوایش داڵغـە و تارمایی جـەرگ و هەناویان ئەبرن .

رۆژێك لە رۆژان یەکێ لـە خزمانی سـەرۆکی دەستەی جەردەکان بانگی کرد بۆ نان خواردنی ئێوارە ، بـە بۆنەی ژنهێنانی یەکێك لە کوڕەکانیەوە . ئـەمیش چوو بۆماڵیان ..

بەو بانگ کردنـە هـەمـە جـۆر خـەڵك کـۆ کرابوویەوە : فەرمانبەر و بازرگان و خاوەنپیشـەکان و خوێندەوار و نەخوێندەوار ..

سفرە و خوان بە خواردنی هەمە جۆری ، نایابی ، بەتامی ، زۆر و زەبەندە ، رازایەوە . بانگ کراوانیش هەر دەستەیەکیان لە دەوری خوانێك کۆڕیان بەست و

سەرۆکی دزانیش لەگەڵ کۆرپێکیانا دانیشت • سەیری خوانەکە و ئەو قاپانەی کرد کە بە سەریەوە ریز کرابوون ، راستە و خۆ لە بەر دەمیا قاپێك دانرا بوو ، دوو کۆتری سوورەوەکراوی لە سەر بوون •

بۆ ماوەیەکی زۆر چاوی بڕیە جووتە کۆترەکە و چیرۆکی بازرگانی کوژراوی هاتەوە یاد ، کە دادی بردە لای جووتە کۆترەکە ، تا شاهێدیی بۆ بدەن ، سەری داخست و بە درێژە ، هەموو لایەن و بەشەکانی رووداوەکەی لە مێشکیا دووبارە کردەوە و هێنایەوە یاد، جا بۆ ئەوەی رووداوەکە بە تەواوەتیی دووبارە بکاتەوە ، بە بێ ئاگا ، دایە قاقای پێکەنین ، تا دووبارە کردنەوەکەی پێکەنینەکەی ئەو کاتەی بێت کە هەڵمەتی دایە سەر کوژراوەکە •

ئیتر لە بیری نایە لە کوێ دانیشتوە و کێ وا بە چاو و گوێوە • بە بێ ئاگا کەوتە یاد کردنەوەی ئەو کاتە و تەنها بە لاشە لەوێ دانیشتبوو ••

مات بوون و وڕبوونی بۆ ماوەیەك ، ئینجا دانیە

ئافای پێکەنینێکی درێژی بێوادە و نەگونجاو، سەرنجی پیاوانی دەور و بەری راکێشا • لە راستیدا هیچ باسێك وە یا کردەوەیەك نەهاتبووە کایەوە، تا پێویست بە وڕبوون وە یا پێکەنین بکات •• چونکە ئەو خەڵکە بۆ شایی کۆ کرابۆوە، نەك بۆ ماتیی و مەلوولیی ••

لە هەموو لایەکەوە سەرنجی ئەدرا •• بە سەرسوڕمانەوە پرسیار ئەکرا : ئەوە چی بوو ؟ ئەو پیاوە چی لێ قەوماوە ؟ ئەمیش کە هەوێستی ئاسك بوو و ویستی پینەی لە دەست دەرچوونەکەی بکات، بە بێ ئاگا هەناسەیەکی قوولێ هەڵ کێشا و بەبێ ئەوەی ورد بێتەوە، وەك هێزێکی نادیاری بە دەسەڵات زمانی ناچار بکا، بەبێ هەست بێتە گوفتار، دەستی کرد بە گێڕانەوەی بەسەرهاتی ئەو بازرگانە داماوەی کە وەك تالانی کرد بە ناڕەواش خوێنەکەی رێژرا •• وردە وردە دەستی کرد بە گێڕانەوەی چیرۆکەکە هەر لە نووکەوە بێ ئەوەی هیچی لێ بپەڕێنێ •

بەڵێ، بە بێ ئاگا دانیشتوانی ئاگادار کرد • جا کە

لـه باسەکەی بۆوە ، هەستی بەوە ئەکرد کـە کۆڵێـکی زۆر قورس بە سەر شانیەوە بووە و ئێستا دای ناوە و لێی رزگار بووە • بەلام دانیشتوان بە پێچەوانەوە ، کە ئەم باسە دڵ تەزێنەیان بیست ، هەموو وڕ بوون و دەمیان دا چەقی و بێ دەنگ سەرسام مان •

کە سەیری خەڵکەکەی کرد ، چۆن سەرسام بوون و بەسەرهات، کە سەرنجی راکیشان ئەویش راچلەکیی•• هاتــە هۆش خۆی :

چی کرد بە خۆی ؟ پەنجەی پەشیمانیی ئەکرد بـە دەما ، بەڵام تازە کار لە کار ترازاوە ••

زمانی هاتبووە گفت و نەیئەتوانی بیوەستێنێ ، هـەر وەك زمانی ئەو نەبێ بووبێتە زمانی هێزێکی بالادەست ، کە نەتوانێ چاری بکا ، وە یا بەرگریی لێ بکا ••

مەگەر تەنها خوا نەخشە بکێشێ ••

مەگەر تەنها خۆی دەست بوەشێنێ ••

مەگەر تەنها خۆی تۆڵە بسێنێ ••

چونکە هەر خۆی زانا و دانایە، بە دەست و توانایە ئاگادار و کردار رەوایە ••

## ٤

بەســـەرهاتی بازرگانی مرسـڵیی ، ئەگـەر چـی خەڵکیی لـە یادی چوو بوو و ، لە بـەر نـەزانراویی تاوانبار ، خرابووە گۆشەی لـە بیر چوونەوەوە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشا زۆربەی ئەوانەی کە لە کاتی خۆیا بـەر وێیان کەوتبوو و ئێستەش لە ژیانا بوون ، زۆریان پێ خۆش بوو ئەو کەسە بناسن ، کە ئەو موسڵمانە غەریبـە بێتاوانەی ئاوا رەنجەڕۆ کرد •

هەر ئەوەندە باسەکە لە دەمی تاوانبار دەر چوو ، دوای چەند سەعاتێك بە هەموو شاری حەڵەبدا بڵاوەی کرد و بووە باسی هەموو کۆڕ و کۆمەڵێك • جا هـەر وەك دانیشتوان بیستیان والیی حەڵەبیش بیستی و ناردی بـە نموێن تاوانبارا و لـە سەر شاهێدیی خۆی خستـیە بەندیخانـەوە تـا بە وردیی لێی بکۆڵرێتـەوە • والیی فەرمانی دەر کرد بۆ فەرماندەی پۆلیس تا بـە شێوەی رەسمیی دەست بکا بە لێکۆڵینەوەی • ئەویش فەرمانی دا : با ئەوانەی کە ئامادەی ئەو کۆڕی شـایە بوون و

راستەوخۆ ئەو چیرۆکەیان لە دەمی تاوانبار خۆیەوە بیستووە ، بانگ بکرێن • شاهێدەکان کۆ بوونەوە و هەرچیان لەو بارەوە بیستبوو گێڕایانەوە و تۆمار کرا •

ئنجا تاوانباری بانگ کرد و وتەی شاهێدەکانی بۆ گێڕایەوە • هەر کە ئەمەی زانی بۆی دەرکەوت تازە کار لە کار ترازاوە و شاردنەوەی بۆ نیە ، ئیتر ورەی رووخا و خۆیشی دانی نا بە تاوانەکەیدا •

وتەی شاهێدەکان و دان‌نانی خۆیشی بە تاوانەکەیا کۆ کرایەوە و نێررایە بەر دەمی قازیی شار و ئەویش فەرمانی دا بدرێت لە سێدارە ••

والي شار وتی : شاهێدیان دا ••

وە قازیی شار وتی : شاهێدیان دا ••

وە فەرماندەی پۆلیس وتی : شاهێدیان دا •

وە خەڵکیی وتی : شاهێدیان دا •

بەڵێ جووتێ کۆتر شاهێدیان دا •• تا هەموو کەسێ بە چاکیی لە قووڵایی دڵیا جێ گیر بێ ، خوا تۆڵە ئەسێنێ و چاوپۆشیی لە هیچ ستەمکارێ ناکات ••

لـه دۆاشەوی ژیانیا ، کە بۆ بەیاپی ئـەدرا لـــە سێدارە ، داوای کرد چاوی بکەوێ بــە ژن و منـــاڵ و خزمەکانی ••

دوای ئـەوەی بــە یــەك ەیشتن ، ژنــەکەی لێی پرسیی : چۆن وا ەو نهێنییە شارراوەت ئاشـکرا کرد ، دوای ئەوەی چەند ساڵێك شاردتەوە و پاراستت ؟!

هەروەها منانەکای ، خزمەکانی ، هەر ناســراوێ بکەوتایە قــە لە ەڵیا هەمان پرسیاریان لـێ ئـەپرسیی : ئەویش یەك وەڵامی لـە قوولایی دڵیا بڕیــار دا بوو و لەوە بەو لاوە باوەڕی بە هیچی تر نەئەکرد ، کە ئـەی وت : « ویـستێکی بەهێز و دەسەڵات ، ویستمی بەنج کرد و ناچاری کردم بێمە گوفتار » •

بەڵێ ، ئەو خوایەی کە مافی هەموو کەسێ ـ بــە بە دانایەتیی خۆی بۆ دیاریی‌کردنی کات و شــوێن ـ ئەسێنێ ، بە زۆر هێنایە زمان و خۆی شاهێدیی لـە سەر خۆی دا ، هەر تەنها بە بینینی جووتە کۆترەکە !!

## ٥

رۆژ بوویەوە و جەردەی خوێنڕێژ بەرەو گۆڕەپانی لەسێدارەدان درایە بەر، تا لەوێ بە سزای خۆی بگات ..

برایە شوێنی تایبەتیی و پەتەکە خرایە ملی و ئا لەو کاتەدا هاتە گوفتار و وتی :

« من بە زمانی خۆم قسەم نەکردووە ، بەڵکو بە زمانی هەردوو کۆترە سووردەوەکراوەکانی سەر ئەو قاپەوە قسەم کرد ، کە ئێوارەی بانگ کردنی نمایەکە لە بەر دەمما دا نرا بوون » .

پەتەکە لە ملیا توند کرایەوە تا گیانی دەر چوو ..

خەڵکێکی زۆر لە دانیشتوانی شار کۆبوونەوە بۆ دەربڕینی پێخۆش بوونیان ، بە بۆنەی ئەوەوە کە کۆمەڵەکەیان لە تاوانبارێکی خراپکار رزگاری بووە.

لە کاتێکا خەڵکەکە لە خۆشیی و یادی خوادا بوون، هەر ئەوەندەیان زانی دەستە دەستە باڵندە ئەهاتنە سەر سەری سەرۆکی جەردەکان و ئەوەندە خۆیان نزم

ئەکردەوە خەریك ئەبوو بەر سەری تاوانبار بکەون ، وەك بیاەوێ دەنووکی لێ بدەن و لێی بخۆن ..

لە ناکاوا خەڵکەکە دەنگی پێ خۆشبوونەکەیان گۆڕیی بە وتنی « لا اله الا الله » و « الله اکبر » بە دەنگی بەرز ، ئەمەش کاتێ کە بینییان وا دوو کۆتر پەیدا بوون و هەردووکیان بە سەر سەری لەسێدارەدراوەکەوە نیشتنەوە و بە هیچ شێوەیەك بە سەریەوە لا نەئەچوون !

خەڵکەکە بە دەنگێکی بەرزەوە و بە یەکجار وتیان: « شاهێدیان دا ! » .

بەم شێوەیە دادگای سەرزەویی بە هیچ جۆرێ نەیتوانی جەردەی پیاوکوژ بدۆزێتەوە و نەیتوانی لە نهێنیی و چۆنیەتی کوژران و تاڵان کردنی بازرگانی موسڵیی تێ بگا ، وە بۆ چەند ساڵێك بە شێوەی نهێنییەکی داپۆشراو مایەوە ، تا ئەوە بوو دادگای ئاسمان ، ئاشکرای کرد .. تۆڵەی لە جەردەی ناپاك سەند و ناچاری کرد خۆی شاهێدیی لە سەر خۆی بدا ..

هەر چەندە خوای گەورە چەند ماوەیەك جلەوی بۆ شل کرد ، بەلام لە کاتی دیاریی‌کراو و نەخشە کێشراوا ئەوە بوو دەستی لێ وەشاند .. بازرگانی بێ‌تاوان جووتێ کۆتری کردە شاهێد ، تا خوێنی بەناڕەوا رژاوی بگەیەنن بە دادگا ، بە فەرمانی خوای گەورە ، جووتێ کۆتر رام کران ، تا ئەو مافە بگاتەوە بە شوێنی خۆی .. بوونە شاهێد لە سەری ، تا زمانی بەر بێت و راستیی باسەکە دەر کەوێ و بە سزای خۆیشی بگات ..

# ١

به هه‌تیویی گه‌وره بوو •• ته‌مه‌نی دوانزه سالأن بوو باوکی کۆچی دوایی کرد •• له گه‌ڵ دایکیا هیچ که‌له‌پوورێکیان بۆ به‌جێ نه‌ما •• زۆر ده‌ست کورت بوون ، دایکی ناچار بوو کاره‌که‌ری ده‌ر و دراوسێ بکات ، تا هه‌موو ئێواره‌یه‌ك پاش‌خوانی بۆ بێنێته‌وه و بیخاته به‌ر دڵێ ، وه جله کۆنه‌ی منالانی ده‌ست‌که‌وێ و به لاشه‌ی رووت و قووتیه‌وه بئالێنێ ، وه چه‌ند په‌نجاییه‌کی ده‌ست که‌وێ بۆ کرێی مانگانه‌ی ئه‌و تاقه ژووره رزیوه‌ی که رۆژی ره‌ش ناوی نابوو ژوور بۆیان و به ناچاریی خۆیان دا بوویه ژێری •• ئای که هه‌ژاریی و ده‌ست کورتیی ده‌ردێکی کوشنده‌یه •• ئای که ئاده‌میزاد به درێژایی مێژوو گیری به ده‌ستیه‌وه خواردووه ، هه‌ر له به‌ر ئه‌وه‌ی به‌رنامه‌ی ئاسمان له کۆڕی ژیان دوور خراوه‌ته‌وه و رێبازی نه‌فامان باڵی ره‌شی کێشاوه به سه‌ر ژیانی مرۆڤدا ••

بەڵێ ، ئەو هەموو یاسایانەی کە ئیسلام نەخشەی کێشاوە ، بۆ نەهێشتنی هەژاریی و مەزۆگەرکردنی ژیانی هەژاران ، ئەگەر ئەو یاسایانە لە کۆڕی ژیان دوور خرانەوە ، ئەوا سەرهەڵدانیی روو ئەکاتە مرۆڤ ..

ئەوەتا پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ ئەیخاتە بەر چاوی موسڵمانەکان ، کەوا خەریکە هەژاریی و نەبوونیی ، کوفر و بێئیمانیی بێت ، تا موسڵمانەکان ئەگەر ئەیانەوێ ئاینەکەیان پەرە بسێنێ قەڵاچۆی ئەو دەردە کوشندەیە بکەن ، کە ئەفەرموێ !

**« كاد الفقر يكون كفرا ، وكاد الحسد يغلب القدر » .**

**الطبراني والشهاب(١)**

وە لە خوای گەورە ئەپاڕێتەوە تا لە کوفر و هەژاریی و ژێردەستەیی و هەڵوێستی سەرشۆڕانەی دنیا و قیامەت پەنای بدات ، ئەمەش تا موسڵمانەکان بزانن دوای کافرێتیی هەژاریە و پێویستە کۆمەڵی لێ رزگار

---

(١) بەڕاوی « منهاج الصالحين » ل٥٢٥ .

**« كان ـ صلى الله عليه وسلم ـ يقـول بين الركن والحجر الاسود : اللهم اني اعوذ بك من الكفر والفقـر والذل ومواقف الخزي في الدنيا والاخرة » ٠**

**أبو حنيفة(٢)**

دایکه هەر خەریکی کار و فرمانی دەر و دراوسێ بوو ، تا ژیانی کزلەمەرگیی خۆی و کوڕەکەی مسۆگەر بکا ٠٠ بە دەست کار و فرمانەوە هیلاك و ماندوو بوو ٠٠ لاشەی بێهێز و لاواز کەوت ٠٠ تووشی نەخۆشیی سیل بوو ٠٠ کەوتە ماڵەوە ٠٠ توانای کار کردنی نەما ٠٠ کەسێ نەبوو پاروویە نان بدا ، بە خۆی و کوڕەکەی ٠٠ بەتەواوەتیی تەنگی پێ هەڵ چنرا ، ناچار بوو پەنا بەرێتە بەر خەستەخانەی میریی و تیایا بخەوێت ، لە لایەکەوە، تا دەرمانی نەخۆشییەکەی دەست کەوێ و لە لایەکی ترەوە، تا پاروویە نانی بەلاشی دەست کەوێ٠ بەڵام ئەوی لاواز و بێگیان ، لە لایەکەوە ، بەرگەی ئازار و مەینەتی

---

(٢) بەڕاوی « منهاج الصالحين » ل٥٢٥ ٠

ئەو نەخۆشییەی نەئەگرت کە بە جارێکا لاشەی دا هێنا بوو ، وە لە لایەکی ترەوە ، بەرگەی ئەو خەم و خەفەتە جەرگ برەی نەئەگرت کە بۆ کوڕە تاقانە بێ کەسەکەی چوو بووە دڵیەوە کەوا لە ژوورەکەیدا بە تاق و تەنیا مابوویەوە .. بەم شێوەیە دایکە دوو نەخۆشیی یەخەیان پێ گرتبوو : نەخۆشییەك کە لاشە بێهێزە لاوازەکەی تێك ئەشکاند ، وە نەخۆشییەك کە ئازاری دڵ و دەروونی ئەدا بە بۆنەی جگەرگۆشە تاقانە بێنازەکەیەوە .

خوای گەورە هەر خۆت خوایت ..

خوای گەورە هەر خۆت بێ باکیت ..

کارەکانت هەر هەموویان پڕن لە دانایەتیی ..

دایکی دڵ پڕ غەم و پەژارە ، بە مەراق و خەفەتەوە بۆ دوایین جار چاوەکانی نا بە یەکا و ئیتر هەلی نەهێنانەوە ؟ کوڕی بێ کەسیش بە تاقی تەنیا ، بە کۆڵێ غەم و پەژارە و مەینەتەوە ، بە جێ ما . نەی ئەزانی چۆن بیر لە دوارۆژ بکاتەوە . ناچار بوو دەست لە قوتابخانە هەڵگرێ تا نان پەیدا بکا .. چووە لای

وەستا دیوارێك و بووە شاگردی •• بەڵام ، لە بەر ناچاریی ، بە کرێیەکی زۆر کەم تا وردە وردە لە سەر کارەکەی را هات و دوای چەند ساڵێك بووە وەستایەکی کارامە و لێهاتوو •• بەمە ژیانی ئابووریی چاك بوو و

دوای ماوەیەك کارکردن بە زیریی و سەلیقەوە و پاشەکەوت کردنی هەندێ لەو پارەیەی ئەهاتە مشتی ، وای بە چاك زانیی خۆی لە ژیای تەنیایی رزگار کا و نیوەکەی تری ئاینەکەی تەواو کا بە ژن هێنان ••

بیری کردەوە ئەو وەستایەی کە لە ڕۆژانی ڕەشدا گەیشتە فریای و ئەم پیشەیەی پیشان دا ، هەر ئەو بۆ ئەوە ئەشێ پشتی پێ ببەستێ و بگاتە فریای ، بۆیە لە کچەکەی چووە پێشەوە و خوازبێنیی لێ کرد ، تا بیکاتە هاوسەری ژیانی • وەستایش کە کوڕی بە چاکیی ئەناسیی و هەستی بەوە کرد بوو ، کە مرۆڤێکی دامەزراو و ڕەوشت بەرزە ، ڕەزامەندیی دەر بڕیی و کچەکەی بۆ مارە کرد •

ڕۆژ و ساڵ تێپەڕین •• کوڕەی بێ کەس و بێ دەر

خوای گەورە ، بە سۆز و بەزەیی خـۆی ، دەرووی بۆ کردەوە •• بوە خاوەنی ژن و منالی خۆی و خانـووی لرت •• رۆژ بـە رۆژ ناوبانگیی دەر ئەکرد لە بارەی چ کیی کارەکەیەوە و دەستپاکیی و دلسـۆزییەوە تیایا •• بەمە خەلکی لێ کۆ بوویەوە •• هەموو کەسێ بـە ئاوات بوو ئەو کاری بۆ بکات ، بە رادەیەك رۆژانـی جومعـەیش ناچار بوو کار بـکات ، ئـەوەندە خەلـکی چاوەڕوا ی بوون ، نەی ئەتوانی رۆژێك وە یا سـەعاتێك پشوو بدات • ئەمیش بەمە زۆر شادمان بوو ، چونکـە دەستهاتی خێزانـەکـەی زیادی ئەکرد و ژیـــان و گوزەرانیان چاکتر ئەبوو ، بە تایبەتیی هەر دوو ســـاڵ جارێك منالێکیان زیاد ئەکرد •• باوکـە لـە یادی بوو رۆژانی رەشی هەژاریی چ دەردێکیان بە سکی بردووە؟ بۆیە زۆر سوور بوو لە سەر خوێندن و پێ گەیاندنـی منالەکانی ، نیتر هەموو جارێ بە ژنەکەی و منالەکانـی ئەوت : لـە ژیانما زۆر ماندوو بووم ، وە ئاواتە خوازم ، بە کۆمەکیی خوا ، لـە ژیانما و دوای کۆچ کردنیشم ،

ئێوه حەساوە بن .

## ٢

کـوڕی گـەورە زانکۆی تـەواو کـرد .. بوو
فەرمانبەرێکی میریی .. باوکەشی تەمەنی نزیکی پەنج
ساڵی بوو بوویەوە .. تا ئەو کاتەش هەر سەرگەرمی
کارەکەی بوو ..ساڵ بە ساڵ لاشەی بێهێز و توانا ئەبوو
نەخۆشییەکانی زیادی ئەکرد ، کەچی هێشتا ناو بانگیشی
لـە زیادکردنا بوو .. ئێستا زیاتر خەڵکیی ئەوردەیان
لـێ ئەدا .

کوڕی زانکۆ کچێکی هاوەڵی زانکۆی بە تەما کرد
ئەویش ئەمی بە تەما کرد .. کچە بڕیاری دا شـووی
پێ بکا ، بەلام بە مەرجێ ئەو خانووەی کە دایک و باوکی
وان تیایا بە جێ بێڵێ و خانوویەك ، کە گونجاو بێـت
لەگەڵ شان و شەوکەتی ئەوانا ، بـە کـرێ بگـرێت
ئۆتۆمبێلێکی مۆدێـل تازەیش بکڕێت .. وە هـەرچی
پێویستیی هەیە ، بۆ رازاندنەوەی خانووەکـە ، پەیدای
بکا ، لە کەل و پەلی نایاب و فەرشی نـەرم و بەفر گر

هەواساردکەر و جل‌شۆری کارەبایی ..

مێشکی زانکۆ ، ئەگەر پەروەردەی تورئـان وەر نەگرێت ، لـه هەموو کەسێ زیاتر لـه لیتـاوی مـاددە پەرستیی‌دا ، ئەچەقێ .. له هەموو کەسێ زیاتر هەڵپەی دنیایەتی ، چونکە چاوی تەنها ئەم چوار رۆژەی تەمەنی ئەبینێ !

کوڕە ناچار بوو مل کەچ کا بۆ فەرمانی ژنـه .. یەکەم ئافرەتێکی خوێندەوار و خاوەنی بڕوانامەی زانکۆیە، دووەم لـه خێزانێکی دەوڵەمەند و ناسراوە .. بۆیـه پێویـسته راسته و خۆ بـه بێ وت و وێژ و بەرهەڵـمـت کردن فەرمانەکانی جێ بە جێ بکرێت ..

خێزانی تازە دروست بوو ، بێ‌ئەندازە پارەیـان خەرج ئەکرد .. رۆژانی نەبوونیی ، سەری لێ نـەدا بوون .. قەرزی ئەم و ئەویش ، ئاسان دەست ئەکەوت؛ تاوای لێ هات بوو بـه ژێر قەرزەوە .. ئەبوایە کرێـی خانوو و پارەی ئاو و کارەبا تەلەفۆن و .. هتد هەمووی بدایـه .. بۆیـه کوڕە بوو بە ژێر کۆڵـی خەفـەت و

مەینەتەوە ، هەر وەك بوو بوو بە ژێر قەرزەوە •• نەی ئەزانی چۆن تەگبیری ئەم هەموو خەرج کردنە زیادەیە بکا ••

باوکی دڵپاکی خەمخۆری ، حەزی ئەکرد دەستگرۆیەکی کوڕەکەی بکات • بەڵام ئەویش خێزانێکی گەورەی کەوتبوو بە سەرا و زۆربەی منالەکانی لە قوتابخانە و لە زانکۆدا ئەیانخوێند و خەرجێکی زۆریان پێویست بوو ؛ بۆیە نەیتوانی بە پارە و سامان دەستی یارمەتیی بۆ درێژ کا ، بەڵام لە دوو ( وە بوو بە ژێر خەم و خەفەتی کوڕەکەیەوە : لە لایەکەوە بە هەستی باوکایەتیی خەمی بۆ ئەخوارد کە کە گیرۆدە بووە، لە لایەکی تریشەوە بەو بۆنەوە کە نەی ئەتوانیی دەستی یارمەتیی بۆ درێژ کا ••

بەڵام ژنەکەی ، بە خۆی و مێشکی پێش کەوتن خوازییەوە ، مووچەکەی هێشتا بەشی خەرجی خۆیشی نەئەکرد ••

ئەوەی ئەو دابوویە بەر لە جل و بەرگ و داو

دەرمانی جوانیی و سەردان و سەیران و ئاهەنگی
رابواردن بەو مووچەیە نەئەکرا ، بۆیە وەك
یارمەتیی خەرجی ماڵەوەی نەئەدا هێشتا دەستی لە
مێردەکەشی پان ئەکردەوە ، تا بتوانێ ئەو هەموو کارانە
ئەنجام بدا ؟ گوایا با دیمەنی ، دیمەی ئافرەتێکی
زانکۆیی رۆشن‌بیری شیاو دەرچێت . با ئەم و ئەو تانە
لە خۆی و مێردەکەی نەدەن .. ئەو مێشکە پووچەڵەی،
کە تەنها هەستی نۆکەرایەتیی کافرانی تیایە ، وەها بیر
ئەکاتەوە و وایش ئەزانێ مەرجی مرۆڤایەتیی تەنها
بریتییە ، لەو خۆ ڕازاندنەوە و خۆدەرخستن و هاش و
هووش و ڤیز و فشەیەی کە ئەوان دڵیان بۆ لێ ئەدا !
ئیتر هەست و سۆز و بەزەیی ، خۆشەویستیی و رێز ،
خزمەت و هاوکاریی و خۆماندووکردن ، خەم خواردنی
مرۆڤایەتیی ، بە هیچ شێوەیەك نایەت بەو دڵ و مێشکە
بەنج کراوانەدا ، کە تەنها مادده ئەبینن و تا رادەی
پەرستنیش خۆشیان ئەوێ ..
هەر چۆن بێ کوڕی هەڵگری شەهادەی زانکۆیی

ھەر خەریکی قەرز و قۆڵەی بێ جێ بوو ، و ڕۆژ بە ڕۆژ باری سەرشانی قورس‌تر ئەبوو .

## ٣

خوای گەورە وای هێنایە پێشەوە ، کوڕەکە پارچە زەویەکی لە کۆمەڵەی خانوو دروست‌کردنی ئەو وەزارەتە کە ئەو ئیشی تیا ئەکرد ، بە نرخێکی هێمایی ، وەرگرت ..

بەڵام خانووکردنەوە پارەی ئەوێ ، ئەویش پارەی نەبوو ، کەسیش نەی ئەوێرا قەرزی بداتێ ، بە چی بیداتەوە ؟ باوکە جگەری بۆ کوڕەکەی هەڵ ئەقرچا .. بەڵێ کوڕێکی لاسار و نەزان‌کارە .. ژن‌ئاغایە .. خۆش‌ویستنی دنیا و مادده چاوی کوێر کردووە... بەڵام لەگەڵ ئەوەشا دڵی وەهای پێ خۆش بوو ، لە مەینەت و دەردی سەری ، بە دوور بێت .. هەتا توانای هەیە یارمەتیی بدا و هەوڵی سووک‌کردنی باری سەرشانی

بەدات ..

بۆ ئەمە بڕیاری دا لە سەر ئەرکی خۆی خانووەکە بکاتەوە بۆ کوڕەکەی . وە چووە ژێر ئەوەوە و بەڵێنی دا هەرچی کەرەسەی ئەو خانووە هەیە بی‌سێنێ و هەرچی ەرکی ئیش و کاریشیەتی هەمووی بکرێتە ئەستۆی خۆی .. باوکە دەستی کرد بە خانووەکە ، بەرە بەرە بەرزی کردەوە ، تا ئەوە بوو لە ماوەی دوو ساڵدا تەواوی کرد .. بەڵام مەرجی لەگەڵ کوڕەکەیدا ئەوە بوو کە خانووی تازە تەواو بوو ، پێکەوە تیایا دانیشن .. بە تایبەتی ئەوە بوو منداڵەکانی بە کوڕ و بە کچەوە خوێندنیان تەواو کرد و کوڕەکان بوونە فەرمانبەر و کچەکانیش هەر یەکەیان چووە ماڵی خۆیەوە ، ئیتر ئەو دەستە خانووەی ئەو بە کرێی گرتبوو کەسی تیا نەمابوویەوە جگە لە خۆی و ژنەکەی . لە لایەکی ترەوە ، ئەمیان کوڕی گەورە بوو و حەزی ئەکرد لە نزیکیا بژی تا دڵی پێی بحەسێتەوە .. هێشتا نەگواستبوویانەوە بۆ خانووی تازە ، دایکی کۆچی

دوایی کرد و باوکی به تەنیا مایەوە ..

هەر چۆن بوو خنوو تەواو بوو و کوڕە گواستیەوە ناوی و باوکیشی لەگەڵیا دانیشت ، کە لەو کاتەدا تەمەنی گەیشتبوە شەصت ساڵیی .. ساڵ بە ساڵ لاشەی بەرەو کزیی و لاوازیی ئەچوو .. نەخۆشی و دەرد و دا سەریان لێ ئەدا ..

لە ئەنجاما بە تەواویی پەکی کەوت و توانای کارکردنی نەما ..

باوکە تا خانووی ئەکردەوە بەڕێز بوو ، وە تا پارەی پەیدا ئەکرد هەر باش بوو ، بەڵام کە نەخۆش کەوت و توانای کاسبیی نەما ، وەکو سەبەتەی بەن بڕپاڕی لێ هات .. کەسێ نەبوو نازی بکێشێ .. بەرە بەرە ڕێز و خۆشەویستی نەما ، کوڕە کەوتە بڕ و بیانوو لە باوکی داماو .. ڕۆژ بە ڕۆژ گیر و گرفت زیادی ئەکرد ، تا وای لێ هات ژیانیان لێ تاڵ بوو بوو .. ئەوەی کە زیاتر کوڕەی هەڵ ئەنا لە دژی باوکی ، ژنە بەناو خوێندەوارە ڕۆشنبیرەکەی بوو .. تا خەزووری خانووی بۆ

ئەکردنەوە و رۆژانە پارەی بۆ پەیدا ئەکردن پێڵاوی بە سەر چاوان بوو ، ئیتر لەوە بە دوا کەوتە لووت و پۆزت و ناوچاو بەیەکا دان ، کەوتە دەربڕینی ناڕەزایی لە بوونی خەزووریا لەو ماڵەدا .. کوڕی بە ناو خوێندەواری خوانەناسیش هەموو جارێ هەر بەڵێی بۆ ئەکرد ..

جارێ بیانووی ئەوە بوو خەزووری دەست ئەخاتە ئیشی تایبەتیی ئەوەوە ..

جارێ بیانووی ئەوە بوو توانای نیە خزمەتی بکا و کار و فرمانی زۆری کەوتووە بە سەرا ..

جارێ بەوە تاوانباری ئەکرد لە ماڵەکەدا ئاگری جەنگ و ئاژاوە خۆش ئەکا و مایەی پشێویی خێزانەکەیە ..

جارێ تاوانی ئەوەیە منداڵەکانی تووشی نەخۆشیی ئەکا ..

وە جارێکیش بەوە تاوانباری ئەکرد دواکەوتووە

و هەڵس و کەوت و باو و نەریتی کۆمەڵی تازەی پێش کەوتوو نازانێت ..

هەموو رۆژێ ئەم بیانووانە و وێنەیان وەك پێش نیارێك ، بگرە وەك شکاتێك ، ئەخرانە بەر دەم مێردی ( پێش کەوتوو ! ) .. تا لە دواجارا وەك بوومەلەرزە ماڵەکەی هێنایە شۆکە و وەك هەورەتریشقە ماڵەکەی هێنایە سەر دەنگ و بە مێردەکەی وت : یان ئەبێ باوکت لەم ماڵەدا بێت ، یان من .

جا یان مانەوەی من هەڵبژێرە ، یان هی ئەو .. بەڵێ مرۆڤی خوانەناس ، بێوەفا ، ئەگەرچی خوێندەواریش بێت ، ئەوە پیشەیەتی .. تا مەبەستی هەبێت و بەرژەوەندیی بەدیی بکات گونجاو و رێك و پێکە ئەگەر نا مەپرسە لە سپڵەیی و بەدنمەکیی .

٤

ئەوەبوو باوکە خانووی کورەکەی بە دوو ساڵ ، تەواو کرد ؛ کە ئەیتوانیی بە دوو مانگ تەواوی بکا..

هەموو رۆژێ ئەچووە سەر ئیشی ئەوانەی کە

خاتوویان پێ ئەکردەوە تا کاتی دەست هەڵگرتن ، کەمێ ئەحاسەیەوە و ئینجا لەگەڵ ئەو کرێکارانەدا کە ئامادە بوون ئیشەی زیادە بکەن ، دەستی ئەکردەوە بە ئیشەکەی تا پارەی زیاتر وەر بگرێ و بتوانێ خانووی کوڕەکەی تەواو بکا ، بەم شێوەیە ئەمەش رۆژی هەفتە کاری ئەکرد کە رۆژی جومعەش ئەهات بەیانی زوو ، لەگەڵ کرێکارەکانیا ، ئەچووە سەر ئیش و دەستی ئەکرد بە بنیاتنانی خانووی کوڕەکەی ..

رۆژانی جومعە بەیانیان زوو دەستیان ئەکرد بە بە ئیش و بەشی یەکەمی شەو تێ ئەپەڕیی ئەوسا دەستیان هەڵ ئەگرت ؛ لەگەڵ ئەوەشا زۆربەی کرێکارەکان دەستیان لە رۆژانەکەیان هەڵ ئەگرت و پێیان ئەبەخشی، هەر لە بەر ئەوەی سەرۆکی ئیش کردن و وەستای پیشە و باوکی رێنیشاندەر بوو تا مەشق بکەن لە سەر فێربوونی پیشەی وەستادیواریی .

باوکە ئەوەندە بە دڵ لێ بڕابوو بۆ بەجێهێنانی ئەرکی سەر شانی ، هەتا ئەگەر بەزستانا تووشی

هەڵامـەت و سـەرماش بهوایە ، دەسـتی لـە ئیش هەڵ نەئەگرت و پێوویەکی نەئەدا ..

لە لایەکی ترەوە ، لەو کاتەدا کە پارەی پێویست بوو بۆ کڕینی شـتوومەکی خانووەکە ، ناچـار ئـەبوو دەست بگرێت بەو پارەیە کە هەفتانە ئەهاتـە دەسـتی ، بۆیە بە باشیی پێویستیی ماڵ و منداڵەکەی خۆی جێبەجێ نەئەکرد و زۆر کەم پارەی بۆ سەرف ئەکـردن .. لـە هەمان کاتا ئەو کەل و پەلەی کە لە خانـووی ئەوانەی ئەو ئیشی بۆ ئەکردن ئەمایەوە کەڵکی لێ وەر ئەگرت، دوای ئەوەی بە خۆڕایی ، لـە بەر ڕێز و پایەپێدانی ، پێشکەشیان ئەکرد ..

بەهەر حاڵ بوو .. بە حاڵی ناچاریی و کولەمەرگیی و خێشەخێش ، باوکە بە ڕەنجی شان و عەرەقی ناوچاوان و لـە سەر حیسابی لەش و تەندروستیی خۆی و نان و بەرگی خۆی و خێزانەکەی ، توانیی خانووەکە تـەواو بـکا ..

بەڵام ئەم ماندووبوون و زەحمەت و ڕەنجە ، هەر

ئەوەندە لە بەر چاو بوو تا کـوڕ و بووك گواســتیانەوە
ناوی ، وە ئەوەندە باوکە نرخی هەبوو تـا لە کاســپیی
کەوت و لاشەی ماندوو و هیلاك و تێكشکاوی ، کەوتە
جێگاوە .. ئیتر لەو کاتە بەو لاوە تەنـگ و چەڵەمە و
گیر و گرفت لەگەڵ کوڕ و بووکا دەستی پێ کرد ..
بووك ئەی ویست ماڵەی بۆ چۆڵ بکرێ تا کەسێ نەبێ
پێی بپرسێتەوە .. تا سەربەستیی ، بکرە بـەرەڵڵایی ،
تەزازی هەبێ لـە هەموو هەڵس و کەوتێکیا لـە نـاو و
لـە دەرەوەی ماڵەکەیدا ..

بەڵێ ، لەو چینـە ئافرەتە بوو کە هیچ سـەنگ و
کێشێکی بۆ حەیا و حورمەت و شەرەف دا نەئەنـا ..
تەنهـا سـەرنجی مۆدێل بگرێ و کوێرانە لاسایی بکاتەوە
.. هەر وەك بڵێی ئەو هەموو خوێندنەی ئەوەندەی لـێ
هاتووە بەرزی کاتەوە و بی گەیێنێتە پلەی تەروتیی !!

ئەو ماوەیەی کە باوکە بە نەخۆشیی لای کوڕەکەی
برو و هەموو رۆژێ شەڕ و ئازاوە و پشێویی بوو لـــە
گەڵیا ، کرا بووە ژوورێکی تاکەوە .. بـە تەنیا تیایـا

ئەژیا •• خواردنی بریتیی بوو لە پاش‌خوان ، وە ئــەم پاشخوانەی لە ژوورەکەی خۆیا بە تەنیا ئەخوارد ، دوای ئەوەی کوڕ و بووك و منالەکانیان لە خواردنی ئەبوونەوە •• باوکی بێنــەوا ، لــەو کاتەوە چوو بووە ئەو ماڵەوە و خزێنرابووە ئەو ژوورەوە ، جلیان نەشۆریبوو ، تەنها مەگەر پیرەژنێك ، کە بە کرێ جلی بۆ دەر و دراوسێ ئەشۆریی ، لــە دەرەوە ، بۆی ئەشۆری بێ •• بەڵام نوێنەکانی ، هەر لەو کاتــەوە لەو ژوورەدا ڕابوون وەکــو خۆیــان ڕابوونــەوە ، نەگــۆڕابوون ، هــەڵ نــەگیـــرابوون ، ڕێــك و پێــك نــەکـــرا بوون ، پاك و خاوێنیان بە خۆیانەوە نەدیبوو ، هــەروەها ژوورەکەشی نە گسك و نە سڕیین و نە پاك و خاوێنیی بە خۆیەوە نەدیبوو ••

کوڕەکەش بە هیچ شێوەیەك چاوی نەئەکەوت بــە باوکی ، مەگەر لەو کاتەدا کە پاش خوانەکەی فــڕێ ئەدایە بەر دەمی ! نــە هەواڵی ئــەپرسیی ، نــە لای دا ئەنیشت ، نە دڵخۆشییەکی ئەدایــەوە ، نە ئەی هێنایــە

سێبەری باخچەی حەوشەوە تا هەوایەکی پاك هەڵ مژێ و تۆزێ مەینەت و خەفەتی کەم کات ، ئیتر ئەو قـاپ و قاچاخەی کە بۆی جیا کرابوویەوە و پاشخوانەکەی تیا ئەبرا بۆی دوای نانخواردن هەر لە زوورەکەیدا ئەمایەوە تـا سەر لە نوێ بۆ ژەمێکی تر پاش خـوانی تری بۆ بهاتایە .. ئیتر کەسێکیان ویژدانی نەبوو بپرسێ ، بزانێ، ئەم باوکە زەحمەت کێشـە رەنـجدەرە ، کە ئێسـتا وا نەخۆش و پەككەوتەیە ، دڵی وا بە چ خواردنێکەوە خۆ ئەگەر پێی بنایە بە جەرگی خۆیا و داوای خواردنێکی لـە کوڕی لاسار بکردایە ، ئەوا بەوپەڕی دڵڕەقیەوە ، وەڵامی ئەدایەوە : ئێستە هەر ئەم خواردنە دەست ئەدا، ئێرە چێشتخانە نیە ، هەرچی تۆ بتەوێ بۆت ئامادە کەن..

بەڵێ هەمیشە نەخۆش بوو ، بـەڵام جار و بـار نەخۆشییەکە تەواو ناڕەحەتی ئەکرد و ئێش و ئازاری زیاتر ئـەبوو ، ئـا لـەو کاتانەدا ئەگەر لە کوڕەکـەی بلالایەتەوە تا بیباتە لای پزیشکێك وە یا پزیشکێکی بۆ بانگ کات ، بە تووڕەییەوە بـە روویا هـەڵ ئەچوو ،

پزیشك چیت لێ بكا ؟ كەلكی چیە ؟

لە جیاتی ئەوەی دڵخۆشیی بداتەوە ، كە بە پشتیوانیی خوا ، نەخۆشیەكەی ئاسانە و بەم زوانە چاك ئەبێتەوە ، مژدەی ئەدایە كە نەخۆشییەكەی ئەوەندە كاریگەرە لای پزیشك چارە و دەرمانی نیە ، تا بە یەكجاریی دەست لە خۆی بشوا !! موسڵمانان خزمەتی گیاندااران و روەكیان كردووە ، نەیان هێشتوە بێ ناز بن ، بەلام ئەوەتا بە ناو رۆشنبیر و دەرچوانی زانكۆ ، ئەوە بیر و هەستیانە .. بیر و هەستێكی نازەلیی ، چونكە دڵەكانیان خاڵیە لە ئیمان ..

ئەو ژن و مێردە لە بەر خۆیانەوە ، خۆیان لە كۆت و زنجیری ئاین رزگار كردووە ، تا زەرڕەیەك ویژدانی تیا نەمێنێ .. چونكە قورئانی پیرۆز و سوونەتی پاكی پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ داوای وەفا ئەكەن .. داوای رێزگرتن لە پیر و پەككەوتە ئەكەن ..

ئەوەتا لەو بارەوە پێغەمبەری خوا ـ صلى الله عليه وسلم ـ ئەفەرموێ :

**« ليس منـا من لم يرحـم صغيرنا ، ويعرف شرف كبيرنا » .**

**رواه الترمذي(١)**

**وەئەفەرموێ :**

**« استوصوا بالكهول خيرا وارحموا الشباب » .**

**رواه الديلمي(٢)**

هەتا لە نوێژا ، چاودێریی پیر و پەككەوتە كراوە، تا ئەوەندە درێژ نەكرێتەوە ئەوان ناڕەحەت بن ..

ئەمە بۆ ریش‌سپیی و پیرەژنان ، ئیتر مەپرسە لەو هەڕەشە گەورانەی كە قورئان و فەرمووده ئەیكەن لەوانەی كە بە خراپیی لەگەڵ دایك و باوكیانا ئەجووڵێنەوە .

پرسیار كرا لە پێغەمبەری خوا ـ صلى الله عليه وسلم ـ لـە بارەی دایك و باوكەوە ، فەرمووی :

**« هما جنتك ونارك » .**

**رواه ابن ماجه**

---

(١) پەڕاوی « منهاج الصالحين » ل٣٦٠ .

(٢) پەڕاوی « منهاج الصالحين » ل٦٨٤ .

بەڵێ دایك و باوك یان ئەوەتا بەهەشتن بۆ ئـە
رۆڵەیەی کە ڕێزیان لێ بگرێ و ڕەزامەندیان بە دەسـ
بێنێ ، وە یان دۆزەخن بۆی ئەگـەر دڵیـان بڕەنجێنێ
سووك سەیریان بکات ٠٠ چونکە ڕەزامەندی خوای لەو
وا لە ڕازیی کردنی دایك و باوکدا و دڵڕەنجانی وا لـ
دڵ ڕەنجاندنیانا کە ئەفەرموێ :

« رضى الرب في رضى الوالدين ، وسخط الرب
سخط الوالدين » ٠

**رواه الحاكم(١)**

بەڵێ کوڕ و بووکی بەناوخوێندەوار بە یەکجار
لـە ئیسلام و لە پەروەردە نایابەکـەی شـۆرابوونەوە
بۆیە تا بەو شێوە دڵتەزێنە سەیری ئەو بێ کەسە پـ
کەوتەیان ئەکرد ٠ با باوك و خەزووریش نەبێت ، ـ
پیاوەتیی زۆری لە گەڵا کردن ٠٠ لە بەر خاتری ئـەو
بوو ئەوەندە خۆی ماندوو کرد ، تا لاشـەی بیهێـز
لاواز ، ئینجا نەخـۆش ، کـەوت ٠٠٠ وە با چاکـە

(١) پەڕاوی « منهاج الصالحين » ل٣٦٢ ٠

پیاوەتیی زۆری بۆیان نەبوایە ـ کە یەکێ لەو چاکانەی دەستەیەك خانووی تازەیە ـ خۆ مرۆڤێکی پێدکەوتـە بوو ، جا ئـەگـەر نموێن کـەوتەی ئیسـلام بوونایـە ، ئەیانزانیی هەتا لەگەڵ پیاوێکی پەڵکـەوتە و نەخۆشـی یەکانەدا چۆن هەڵس و نیشت کەن .. ئەو کاتە سەرنجی ئەو هەموو یاسا بەرزانەیان ئەگرت کە ئیسلامی بێگەرد دەخشەی کیشاون بۆ بەختیاریی کۆمەڵ[1] ..

بەڵام ئەوان لە کوێ و ئیسلامی بێگەرد لە کوێ ؟ ئەوان کە باشخوای خۆیان و منداڵەکنیان ئەدا بە باوکی پیری پەكکەوتە ، لەوەوە فێر بوو بوون ، کە خۆیشیان شوێنکەوتەی پاشخوانی بیـر و هەستی خۆرئـاوان .. ئەو خۆرئاوایەی کە بە هیچ شێوەیەك سۆز و بەزەیی و لێبوردن و لێبڕان و جوامێریی تیا نەماوە! بە رادەیەك هیچ کەس لەوێ لە دایك و باوکی پیری ناپرسێتەوە و باڕن

---

(۱) بۆ نمـوونە سەیری پەڕاوی « منهاج الصالحين » ل٥٠٢ ـ ٥٢٦ بکە

به سەر میریەوە و گیروگرفتێکی بێچارەیە !!

بووکەکە ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر بێزاری خەزووری ئەبوو .. مێردەی هەڵ نەنا دزی .. هەتا بە هیچ شێوەیەك پێی نەئەخستە ئەو ژوورەیەوە ، لە کاتی نەخۆشیا سەری لێ نەئەدا ، وە بە هیچ شێوەیەك قسەی لەگەڵ نەئەکرد وە نەیشی ئەهێشت منداڵەکانی بچن بە دەوریا و لە کاتی نەخۆشیا هەواڵی بپرسن ، وە هەتا پێ بخەنە ژوورەکەشەوە . پەروەردەی خوانەناسین ڕوقی ئاوا هەڵ ئەخات .. هەر کە دانی چیرپ کردەوە هیچ دڕوندەیەکی ناگاتێ !

د

ئەوە بوو لە دوا جارا وەك بوومەلەرزە ماڵەکەی هێنایە شۆکە و وەك هەورەتریشقە ماڵەکەی هێنایە سەردەنگ و بە مێردەکەی ڕاگەیاند ئەو ماڵە یا ئەبێ ئەوی تیا بێ ، وە یان خەزووری ..

کوڕی سەرگەردانی لاکۆڵان و شوێن کەوتەی

بیروباوەڕی کافران ، نەی ئەتوانی بێ دڵیی ژنەکەی بکلت . لە ترسی زیزبوونی خانمیدا خۆی کرد بە زوورەکەی باوکیدا تا لە ماڵ دەری کاتە دەرەوە ؛ چونکە وای بە چاك ئەزانی ، باوکی دەر کا ، تا ئاغای ، ماڵ چۆڵ کات !! وەرزی زستان بوو .. کاتژمێری چواری عەسران .. باران بە خوڕەم ئەهاتە خوارەوە ، ئەو باوکە هەژارەی کە نە خزمەتی هەبوو و نە سەرێکی لە پزیشك دا بوو ، بەو زستانە و لەو زوورە سارد و چۆڵەدا ، چەند نەخۆشییەك سەریان تێ کردبوو : بەینا و بەین کۆکەیەکی توندی لێ ئەهات .. وە نەخۆشیی تەنگەنەفەسیی خەریك بوو هەناسەی لێ ببڕێ .. لەو لاوە نەخۆشیی شەکرە و باڵەپەستۆی خۆین و هەلامەتیش بوو بوونە سەربار ..

هەر ئەوەندە بوو دەرگای زوورەکەی کردەوە ، ئیتر بێ ئەوەی باوکی بدوێنێ ، راستە و خۆ چەمیەوە بە سەر نوێنە شڕۆڵە پیس و پۆخڵەکەیدا و دەستی کرد بە پێچانەوەی و چوار ئێسکە رەق و تەقەکەی

باوکیشی لە گەڵیا گلۆڵە کرد ، ئینجا دەستی کـرد بـە راکێشانی نوێنی پێچراوەی رزیو •• باوکە تێ ـەیشت رۆژی فڕێدانی هاتۆتە بەردەوە •• ئەو خانووەی کە بـە عەرەقی ناوچاوانی کردیـەوە ، خانمی مـەکرباز کوڕی ـەلحۆی هەڵ ناوە ، تا تیایا دەری کاتە دەرەوە ••

زۆر دڵی بۆ خۆی ما ••

خوایە هەر خۆت خوایت ••

نەخۆشیی و بێخزمـەتیی و بێنازیـی و سـەرما و سـۆڵە و تەنیایی ، هەر هەمووی هێشتا هـەر کەمە تـا پێیان پاداشت بدرێتەوە ، مەگەر فڕێ بدرێتە کۆڵان •• دەستی کردە گریان •• گریانێکی بە کوڵ •• بێ ئەوەی لە بێ هێزیا نووزەی لێ بێ •• بۆ ئەو هـەموو رەنـج و تەقەلایە ئەگریا کە بۆ کوڕ و بووکی بێوەفای دا ••

کوڕە باوکەی را ئەکێشا ، کە بیسـتی وا دەستی کردە گریان ، دەستی کردە لێدانی بە شەق و بە زللە ••

وەك پێی بڵێ : بۆچ ئەگریی ؟•• بۆچ گوێڕایەڵی ناکەی ؟ ئەتەوێ وەزعی ماڵ و منداڵم لێ تێك بدەی ؟ چۆن بەڵایەك بوویت بۆ من گەیشتی و لە کۆڵم نابیتەوە ؟!

بە هەر حاڵ بوو گەیاندیە کۆڵان •• بازکی پیری نەخۆش فڕێ درایە کۆڵان •• بەر سەرما و سۆڵە و بارانی بەخوڕەم ••

خوایە یارمەتیت !

هەر کارێك خۆت رێکی نەخەیت چۆن رێك ئەکەوێت ؟

وە هەر تۆڵەیەك خۆت نەیسێنی بە کێ ئەسەنرێ ؟

کوڕە باوکی لە کۆڵان بە جێ هێشت و گەڕایەوە ماڵەوە •• بە پەلە •• سەر و ملی چەماندبۆوە •• بارانەکە زۆر بە تەوژم ئەباریی •• خەمی بوو زیاتر تەڕ ببێ •• بە پەلە دەرگاکەی پێوە دا •• خۆی گەیاندە لای زۆپاکە •• دڵۆپی بارانەکە بە سەریەوە وەستابوونەوە •• خۆی گەرم کردەوە •• باڵەوانانە ،

چونکە سەرکەوتنێکی گەورەی بە دەست هێنا بوو ، هەناسەی سوار بوو بوو .. خانمیش بە زەردەخەنەوە چاوێکی بۆ خست ، وەك پێی بڵێ : کێ مێردی وای هەیە ؟ دەستەکانت خۆش بن .. ئیتر بزانە لەمەولا چەندە خۆشم ئەوێیت .. لە کرۆکی دڵما جێت ئەکەمەوە .. نایەلم دلت گەرد بگرێ .. ئینجا لە خەلات و بەخشینی ئەوەدا ، کە ئەوی زیاتر بە لاوە بەرێز بووە تا باوکی ، پیالەیەك چایی گەرم و وری بۆ تێ کرد ..

خوایە کۆمەکیت !

ئێمەی لاواز پەلەمانە .. تۆڵەمان ئەوێ .. لە راستیدا دڵمان شەیدای دادپەروەرییە و حەزمان لە راستییە ؟ بۆیە پەلەمانە ، دەسەڵاتمان کەمە و بەرگە گرتنیشمان ئەوەندە نیە تا دان بە خۆمانا بگرین ..

بەلام کارەکانت بە لای موسڵمانی شارەزاوە پڕن لە دانایەتیی ، ئەی خوای پەروەردگار ، زۆر بە رێك و پێکیی و بە پێی نەخشەیەکی بێ کەم و کوڕیی ئەنجام ئەدرێن ..

نوێنە رزیوەکان بە بەر بارانەکەوە خوسان ، تا
رێبواران لە دەوری کۆ بوونەوە ، دیارە لە رۆژی
ئازادا رێبوار کەمە .

کاتێ نوێنی پێچراوەیان کردەوە سەیریان کرد
باوکی هەناسە سارد یانی دەرچووە .. لە بەر دەرکادا
و لە بەر بارانی خوڕەمدا دوا هەناسەی ژیانی تەواو
کردوە ..

ئەوەندەی پێ نەچوو هەواڵ درا بە پۆلیس و دوای
کەمێك کۆمەڵە پۆلیسێك ئامادە بوون .. سەیریان کرد وا
خوێن لە دەم و لە سەری باوکی هەزار دەرپەڕیوە
و نوێنە شڕەکانی سوور کردووە ..
کوڕی بێوەفا لە پاڵ زۆپای گەرم و لە
بەرامبەر ژنی مەکربازیا دەر هێنرا و بە تاوانی کوشتنی
باوکی بە دەستی بەستە برایە بەر دەم دادگا .. بڕیاری
دادگای بۆ دەرچوو بە بەندکردنی
درێژایی تەمەن ، ژنی مۆدێل پەرستیش ماڵی کاول بوو
و بە خۆی و منداڵەکانیەوە گەڕایەوە باوان و خانووەکەش

چۆڵ و هۆڵ بوو ، تا پەپوو تیایا بخوێنێ ••

خانوو ماوەیەکی زۆر مایەوە بێ ئەوەی کەسێ بە کرێیش لێی نزیک بکەوێتەوە ••

٦

کوڕی باوك کوژ خرایە بەندیخانەوە •• پانزە ساڵی رەبەقی تەواو کرد •• ژنەکەشی ساڵی جارێ یان دووجار سەری لێ ئەدا •• تا ئەوە بوو لە یەکێ لە بەیاننامە میرییەکاندا چاوپۆشیی لێ کرا و بڕیاری بەرەڵلاکردنی دەرچوو • وە بەڕێوەبەری بەندیخانە هەواڵی دا بە ژنەکەی ، کەوا سبەینێ مێردەکەی بەندیخانە بە جێ دێڵێ ••

بۆ رۆژی دووەم ژنە لەگەڵ ئەو کوڕەیا کە خوێندنی تەواو کردبوو و بوو بووە فەرمانبەر ، خۆشیی خۆشیی ، لێیان دا بەرە و بەندیخانە ، کوڕی هەرزەکار ئوتومبێلی خۆی بە دەستەوە بوو و لێی ئەخوڕیی ••

کە نزیکی دەرگای بەندیخانە بوونەوە ، کوڕە چاوی بە باوکی کەوت ، وا لە دەرگا هاتە دەرەوە :

باوکەش چاوی بە ژن و کوڕەکەی کەوت ، وا هاتن ..
ماوەیەك بوو ئەو خێزانە لە یەکتری بڕڕا بوون..
ئەو ڕۆژە ڕۆژی جەژن بوو .. چونکە بە تەما نەبوون پیاوە هەتا ماوە بەر بدرێ .. ژنەکەی بە تەما بوو تا ماوە هەر وا سەرکز و داماو دانیشێ .. وا ئەمڕۆ ئەم دەروەیان لێ کرایەوە ، بۆ ئەوان جەژنێکی بێهاوتا بوو ..
زۆر بە تاسەوە بوون بۆ بینینی یەکتری ، باوکە بە پەلە هەڵمەتی دا بگاتە لایان ، کوڕەیش بە ئوتومبێلەکەیەوە بە پەلە هەڵمەتی دا بگەنە لای باوکی .. بێ ئەوەی کوڕە ئاگای لە خۆی بێ، ئوتومبێلی بە ئوژمەوە دا بە تەنگەی باوکیا .. باوکە کەوتە سەر زەویی ، کوڕە زۆر پەرێشانی ئەم ڕووداوە لەدەستدەرچوونە بوو ، زۆر شەرمەزار بوو ، چەند بە ئاواتی ئەم ڕۆژەوە بوو بێ باوکی ببینێ لە بەندیخانە بێتە دەرەوە .. پەشۆکا ، ویستی ئوتومبێل بووەستێنێ ، کەچی بە پێچەوانەوە ، فەرمانی خوا جۆرێکی تر بوو ، دەستی پەروەردگار

نەخشەیەکی تری کێشا بوو ، لە رۆژی تاکە جەژنی ئەو خێزانەدا •• نەیتوانی بیوەستێنێ ، بەڵکو بە پەلە و بە توندیی پێی نا بە بەنزینەکەیدا و لە جیاتی وەستانەوە هەڵمەتی دا و لاشەی باوکەی بە یەکا هاڕیی ••

خوایە هەر خۆت خوایت ••

هەر خۆت خاوەنی دەسەڵاتیت ••

هەر خۆت خاوەنی نەخشە و بڕیاریت ••

کوڕە بە پەلە لە ئوتومبێل دا بەزیبە خوارەوە سەر لاشەی تێك شکاوی باوکی ، سەیری کرد گیان ئەدا •• خوێنیش لە دەمی و لە سەری ، سەری کردووە !

چ هەڵوێستێك بوو هاتە بەردەمی کوڕە ؟ یان بە چ نیازێکەوە هات بۆ بەندیخانە و چ رووداوێکیش یەخەی پێ گرت ؟

ئەو باوکی خۆی کوشتەوە و خوێنی لە دەمی و سەری هێنا ، وا ئێستاش کوڕەکەی بە هەمان شێوە کوشتیەوە و خوێنی لە دەمی و لە سەری هێنا ••

ئەو دڵی پێوە نەبوو باوکی لە زوورێکی

خانووەکەدا وەك دیل ، کول ، بەندکراو ، بەو زستانە توزشە ، بمێنێتەوە؛ بەو بارانە خوڕەمە فڕێی دایە تۆلان، وا کوڕەکەشی هاتووە بە سواری ئوتومبێلەکەی بە ڕێز و شـــادیی و خۆشـــیەوە ـ دوای رزگاربوونی لـــە بەنـدیخانە ـ بێ باتە مالەوە کـەچی دەســـتی بـ روەردگـار وای نـەخشـــە کێشـا بێ خـاتـە ژێر پێچکەی ئوتومبێلەکەوە و بێ هاوڕێ ؤ بە هەمان شێوە خوێن بێتەوە لە دەمی و لە سەری ..

دەسەلاتی زەویی بڕیاری دا تا ماوە ( تەنهـا ئـەم ژیانەی دنیا ) لە بەندیخانەدا بێ ، بەلام هێشـتا بەودشـەوە نەوەستا ، دوای پازدە سال بەری دا ، وەك تاوانـەکەی هەر تەنهـا بایی ئەوەندە بوو بێ ، کـەچی دەسـەلاتی ئاسمان تۆلەی راستەقینەی بۆ گەیاند کە بەندکردنی بێ لـە قەبرا و دوایش ناردنی بۆ ناو ئاگری دۆزەخ هەتـا هەتایە .. هەتا هەتایە ..

خوایە یارمەتیت .. سەرگەردان نەبین ، چـۆن بەرگەی هەتا هەتایی دۆزەخ ئەگرین ؟ ..

خوایه کۆمەکیت ٠٠
مەگەر خۆت بگەیتە فریامان ٠٠
بەڵێ خوێن رشتن تاوانێکی زۆر گەورەیە ، بۆیە پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ هەرەشە ئەکا لە خوێن رێژەکان ، تا چاك بزانن هەر یەکەیان خوای گەورە کەسێکی بۆ تەرخان کردووە ئەبێ نەمرێ تا بی دۆزێتەوە ، کە ئەفەرموێ :

**« لا يعجبنك رحب الذراعين يسفك الدماء ، فان له عند الله قاتلا لا يموت ٠٠٠ »**

**رواه أبو داود(١)**

بەڵێ ، خوای گەورە یاسایەکی رەنگینی نەخشە کێشاوە ، هەر کەسێ چۆن بێ لەگەڵ دایك و باوکیا ، بـا ئەویش هەر بە تەمای ئەوە بێت ٠
بەڵام ژنی دەرچووی زانکۆ و خاوەن مێشکی مۆدێلپەرست ، کە بوونی خەزووری لەوماڵەدا ژیانی لەو تاڵ کرد بوو ، بێ ئەوەی جلێکی بشوا و زوورەکەی

---

(١) لە پەراوی « منهاج الصالحين » ل٢١٠ ٠

گسکێ بدا و خزمەتێکی بکا و هەوانێـکی بپرسێ ، تـا مێردەکەی لە بەندیخانەدا بوو هەر بێوەژن بوو ، وە کە بوو بە ژێر ئوتومبێلەکەشەوە بووە بێوەژنی یەکجاریی ٠٠ ئافرەت مێردی نەبێ ، وە یا بێوەژن بێت شووورەیی نیە ٠٠ هەر وەك پیاو بیێت بە ژێر ئوتومبێلەوە شووورەیی نیـە ، بەلاَم ئەوان بـە تەمای ژیانێـکی زۆر سـەیر بوون ٠٠ خانووەکە بتێك بوو ٠٠ ژیان و مۆدێلات و هاتنی میوان و سەیران و ئاهەنگ و سفرە رازاندنەوە ، وەك بت بە لایانەوە خۆشەویست بوون و بە دڵ بایەخیان پێ ئەدان ٠٠ بۆیە بوونی ئەو باوکە هەژارە لە ئەڵیانا ، ئاوا ژیانی لێ تێك ئەدان ٠٠ هەر کەسێ بەو شێوەیە دنیا بپەرستێ ، تیایا ناحەسێتەوە ٠٠

هەر کەسێ تەنها خۆی و حەسانەوەی خۆی لە بەر چاوی بێت ، هەرگیز ناحەسێتەوە ٠٠

وە هەر کەسیش بیەوێ لە ژیانیا لە بەر رەزامەندی خوا حەسانەوە بە خەڵکیی ببەخشێ و خۆی لە پێناویانـا ماندوو بکات ، خوای گەورە حەسـانەوەی هـەر دوو

جیهانی پێشکەش ئەکات .. یاسای خوای گەورە و دادپەروەرە[1] !

بەڵام ئەو خانووەی کە بە رەنجی شان و عەرەقی ناوچەوانی باوکەکە بنیات نرا بۆ کوڕی بەناو رۆشنبیری خوانەناس ، ماوەی پانزە ساڵ چۆڵ بوو ، بە نیازی ئەوەی خاوەنەکەی بەر بدرێت ، ئەوەتا تا ئێستاش هەر چۆڵە و نە خاوەنەکانی ئەچنە ناوی و نە کەسیش بە کرێی ئەگرێت .. هیچ کەس لێی نزیك نابێتەوە ، چونکە ئەڵێن : خانوویەکی شوومە و کەس تیایا ناحەسێتەوە ..

---

(١) بەڵام لە بیرمان نەچێ ، کە باوکەکە زۆر خۆی ماندوو کرد لە پێناوی کوڕەکەیدا ، وە نەبێ لە بەر خاتری خوا بوو بێ ، بەڵکو سۆزی جگەر هەڵی پێچاوە ، ئەگینا خۆ ئەیزانی کوڕە چەند لە خواوە دوورە ! کێ ئەڵێ ناکەوێتە بەر هەڕەشەی ئەم فەرمودەوە کە ئەفەرموێ :
« من أعان ظالماً سلطه الله عليه » ؟ دیارە زالمیش لە دەستی خوا رزگاری نابێت ..

بیست ساڵ بە سەریا تێ پەڕیوە و هەروا بە خاڵیی ماوەتەوە ..

نە ئەفرۆشرێ وە نە بەکرێ ئەدرێ ، هەروا وێرانەیە و پەپوو تیایا ئەخوێنێ ، بەو دەنگە ماتەمینە یەوە، هەر وەك لە جیانی باوکی بە نارەوا خوێن رژراو بنالێنێ و دەنگی نالینەکەی بیری دەر و دراوسێ بخاتەوە ..

وەك بەو دەنگەی ئامۆژگاریی ئادەمیەکان بکا و بڵێ : خوا ستەمی ناوێ و چاوپۆشیی لێ ناکا .. بە تایبەت لە کوڕێکی بێوەفاوە کە بەو شێوە نامەردانەیە پاداشتی باوکی رەنجدەری زەحمەتکێشی پیری پەککەوتەی بداتەوە . تیاچوون و سەرشۆڕیی هەردوو جیهان بۆ ئەوانەی کە دڵی باوك و دایکیان ئەڕەنجێنن و بە خراپیی لە گەڵیان ئەجووڵێنەوە ..

## ١

له یه‌کێ لــه گۆڕه‌پانه گه‌وره‌کانی شاری به‌غدادا خه‌ڵکێکی زۆر کۆ بووبوونه‌وه بۆ ئه‌وه‌ی دیمه‌نی لــــه سێداره‌دانه‌که‌ی ببینن ‧‧ دیمه‌نێکی زۆر کاریگه‌ر بوو‧‧ ئه‌مه‌ش دوای ئــه‌وه‌ی دادگا بڕیاری له‌سـێداره‌دانی بۆ ده‌ر کرد ‧‧ ئه‌ویش وه‌ك ئه‌وانه‌ی که ئــه‌م جیهانه‌یان بــه جێ هێشت به‌ره‌و باره‌گای راستیی که‌وته رێ ؛ تــا له‌وێ لای په‌روه‌ردگار ، حیسابی خۆی، وه‌ر گرێته‌وه‧‧

لــه ســه‌ر چی له سێداره درا ؟

چی کرد بوو وا بوه په‌ند و ئامۆژگاریی بۆ هه‌موان؟

پیاوێك بوو خه‌ریکی قه‌سـابیی کــردن بوو ‧‧ رۆژێکیان ، وه‌ك رۆژانی تر ، هێشـــتا شــه‌وی ما بوو ، بــه‌ره‌و قه‌ســابخانه که‌وتــه رێ ، ئیتر ئــه‌وه بوو پێش به‌ره‌به‌یـان مــــه‌ڕه‌کانی سه‌ر بڕیی و گواســـتنه‌وه‌ی گۆشته‌که‌ی بۆ دووکان ، سپارد به هاوه‌ڵه‌که‌ی ‧‧

له‌گه‌ڵ به‌ره‌به‌یانا به‌ره‌و ماڵه‌وه گه‌ڕایه‌وه ‧‧ ئه‌و ماڵــه‌ی که ئه‌کــه‌وتــه لاته‌نیشتی کۆڵانێــکی ته‌ســکی

پێچاوپێچی داخراو •• لەو جۆرە کۆلانانەی کـە لـە گەڕەکە کۆنەکانی چل پەنجا ساڵی لەمەو پێشی بەغدادا باو بوون ••

لە کاتێکا ـ کە هێشتا دنیا تاریك بوو ـ لە قەسابخانەوە ئەگەڕایەوە بۆ ماڵەوە و لە دووریی چەند مەترێـکەوە ، لەو کۆلانە تەسکە پێچاوپێچە داخراوەدا ، دەنگی هاوار و دادی بیست ، وەك کەسـێك داوای یارمـەتیی بکا و گیری خواردبێ •• بە پەلە بەرەو دەنگەکە کەوتە ڕێ •• لـە کاتێکا بـە دەم ڕاکردنەوە بوو ئەبینێ وا لاشـەی کوژراوێك کەوتووە و لـە سەرەمەرگایە ، وا خەڵتانی خوێنە و ئەوەندە خوێنی لێ ڕۆیشتووە گۆمێکی دروست کـردووە •• گەیشـتە لای ، بزانێ کێیە ، دەسـتی و جلەکانی خوێنـاویی بوون ، بە فەرمانی خوا چـەقۆی قەسابییەکەی کە بە لاقەدیەوە بوو ، لێی کەوتە خواردوە و کەوتە سەر سنگی کوژراو و ئەویش خوێناویی بوو••

کە ئەم وەزعەی بە خۆیەوە بینی ، تەواو تێـك چوو ، بە دەستی خۆی چی کرد بە خۆی ؟ هێشتا لەمە

رزگاری نەبوو بوو ، نەبەتیەکی تر یەخەی پێ گرت،
دەست و بەرگ و چەقۆ خوێناویی بوون و ئەمیش
شپرزە بووە ، هەر ئەوەندەی زانیی کۆمەڵێک پاسەوانی
شەو دەوریان دا .. دەست بە قامچیی و تفەنگ و
دەمانچەوە ، نەڕاندیان بە سەریا تا هەڵسێتەوە و هەر دوو
دەستی بەرز کاتەوە .. بە ترس و لەرزەوە
هەڵسایە سەر پێ .. بە سەر سەری
کوژراوەوە وەستا .. بەڵام چۆن وەستانێک ؟
هەموو گیانی ، بە تایبەتیی ئەژنۆی ، ئەلەرزیی .. عارەقی
دەر ئەدا .. رەنگی زەرد هەڵ گەڕا .. هەر دوو دەستی
لە ترسانا بەرز کردەوە .. وەک شۆڕە بیی ئەلەرزیی
.. یەکێ لە پاسەوانەکان چەقۆ خوێناویەکەی
قەسابەکەی لە سەر لاشەی کوژراوەکە هەڵ گرت..

چۆن سەر بەرز کاتەوە ؟

ئەوەندەی پێ نەچوو خەڵکێکی زۆر لە دەوری
پاسەوانەکان کۆ بوونەوە دەر و دراوسێ سەریان کێشایە
دەرەوە ، هەندێکیشیان هاتنە دەرەوە بزانن ئەم هەرا

هەرایە چیـە ؟

هەر چۆن بوو قەساب لـە لایەن پاسـەوانەکانەوە درایە بەر و بەرەو نزیکترین پاسگای پۆلیس برا ..

خێرا دەسـت کرا بـە لێکۆڵینـەوە لـە بـارەی کوژراوەکەوە .. ئەوە بوو پاسەوانەکانی شەو شاهێدیان لە سەر دا ، کە ئەوان چوون بە سەر ئـەم قەسابەدا و بـە سەر سنگی پیاوە کوژراوەکەوە بوو ، وە دەست و جلی خوێناویی بوو بوون و چەقۆکەشی لە سەر لاشـەکەی کەوتبوو ، وە جگە لەم کەسێ لە نزیکی کوژراوەکـەدا بـەو بەیانییە زووە نەبینراوە ..

دوا بە دوای شاهێدیی پاسەوانەکان هەندێ لـەو خەڵکەی هاتن بە سەر رووداوەکەدا و ئاگاداری بوون ، شـاهێدییان دا ، کە شـاهێدیی پاسـەوانەکان راسـتە و ئەوانیش هەر وای لێ ئەزانن ، بۆیە دادگای بێ ئاگای سەرزەویی ، بەم شاهێدییە دڵی ئاوی خواردەوە ، کەوا قەسابەکە کابرای کوشتووە ؟ بەمە بڕیاری لەسێدارەدانی بۆ دەر کرد ..

ئیتر کەسێ گوێی نەگرت بۆ هاوار و دادی قەساب، کەڕا دەستی لەو کوشتنەدا نیە ، وە کەسێ باوەڕی پێ نەکرد کە : ئەو بەو بەیانییە زووە لە قەسابخانە گەڕاوەتەوە و بە دەم هاواری کوژاوەوە رای کردووە .. هەر چەند هاواری کرد و هەر چەند پاڕایەوە و هەر چەند سوێندی خوارد ، بێ سوود بوو .. بەڵام دوای دەرچوونی بڕیاری لە سێدارەدانی ، رووی کردە ئەو قازیيانەی کە هەڵسان بە مەحکەمە کردنی و ئەوانەش کە لەوێ ئامادە بوون ، دای بە گوێیانا : « وتەکانی من راستن ، وە وتەکانی شاهێدەکان درۆن ، بەڵام من مافی ئەوەمە کەوا بدرێم لە سێدارە ، چونکە چەند سالێك لەمەو بەر ساڵێکی شیرەخۆرەم لە دایکەکەیم کوشت ، جا بگەڕێن بە شوێن ئەو کەسەدا کە بە راستی ئەم پیاوەی کوشتوە و وا خۆی لە سزا دەربازکرد » ..

دوای ئەوەی بە ویستی خۆی دانی نا بەم راستیەدا، فەرمانی بۆ دەرچوو ، تا بدرێت لە سێدارە ..

## ٢

لەسێدارەدانی ئەم قەسابەش وەك لە سێدارەدانی تاوان بارەکانی تر ، ئەگونجا تێ بپەڕێت ، بێ ئـەوەی شوێنەوارێك لە ناو کۆمەڵا بەجێ بێڵێ ، وە یان هیـچ نەبێ شوێنەوارێکی کەم تاراددیـەك لە کۆمـەڵا بە جێ بێڵێ و دوای ماوەیەك ، لە بیر بچێتەوە ٠

بەڵام ئەم لەسێدارەدانە ، شوێنەوارێکی زۆر قووڵ و کاریگەری لە کۆمەڵا بە جێ هێشت و تا ئێستەش هەر دووبارە ئەکرێتەوە ٠٠ نهێنیی ئەم شوێنەوارەش لەوەدا شارراوەتەوە ئەم پیاوە بێتاوان بوو لـە کوشتنی ئەو پیاوەی کە بە بۆنەیەوە درا لە سێدارە ، بـەڵام لە هەمـان کاتا ستەمی لێ نەکرا بوو کە بڕیاری هەڵواسینی دەرچوو بوو ، چونکە لە راستیدا قـەوزاری کوشتنی منالێك و دایکەکەی بوو ، کە دەسەڵاتی مرۆڤ لە کاتی خۆیدا نەی توانی پێی بزانێ و تۆڵەی لێ بکاتەوە ، بەڵام دەستی خوا لە کارا بوو ، تا لە کاتی دیاریی کراوا ، پەردە لـە سەر ئەو نهێنییە لا بدات و کابرا بە دەمی خۆی دانـی

پیا بنێ و اشکرای بکا ..

ئەم قەسابە لە خێزانێکی زۆر هەژاردا هەڵکەوت، ئەوەندە هەژار بوون بە حاڵ و ناحاڵ نانی وشکیان دەست ئەکەوت .. ماڵەکەیان لە گەڕەکێ لە گەڕەکەکانی بەشی « روصافە » بوو لە بەغدا ..

کاتێ تەمەنی گەیشتە شانزە ساڵان ، ناچار بوو کارێك بدۆزێتەوە بۆ بەخێوکردنی خێزانی هەژار و داماو .. بەلەمێکی پەیدا کرد بۆ پەڕاندنەوەی خەڵکی لە رووباری دیجلەدا لە نێوان دوو لای شاری بەغدادا: روصافە و کەرخ ..

ئەمەش ساڵ بە سەر ئەم کارەیدا تێ پەڕیی و بەو پەڕی هەڵمەتەوە کاری ئەکرد ، جاری وایش ئەبوو بە شەو و بە رۆژ نەئەوەستا و بە هیچ شێوەیەك تامی پشوو و حەسانەوەی نەئەکرد ، جگە لەو کاتەی کە سەری ئەخستە سەر سەرین تا کەمێ بخەوێ ..

لەگەڵ ئەم هەموو هەوڵ و کۆششەدا ئەوەی ئەهاتە مشتی هێشتا بە چ حاڵێك بەشی ژیانی کولەمەرگیی

خێزانە گەورەکەی ئەکرد ، کە لە دایك و باوکێکی زۆر پیری بە ساڵا چوو و پێنج برا و شەشی خوشك پێك هاتبوو ، وە کە خۆی نەوبەرەی دایك و باوکی بوو ..

هەژاریی دەردێکی زۆر کوشندەیە .. کاتێ مرۆڤ دیمەنی ملیۆنەها خێزانی هەژار لە سەر زەویدا دێنێتە بەر چاوی ، خەریکە دڵی بوەستێ .. رۆربەی زۆریان لە بەر کەمیی و ناتەواویی خۆراك تووشی نەخۆشیی جۆرا و جۆر ئەبن ..

لە هەمان کاتا کە دیمەنی دەوڵەمەندەکانیش دێنێتە بەر چاوی ، چۆن سەریان کردۆتە کۆکردنەوەی پارە و دەستیان داوەتە رابواردن و کەیف و ئاهەنگ هەر وەك لە سەر زەویدا مرۆڤێکی برسیی نەبێت ..

هۆی ئەم دەردە کوشندەیە ، کە جەرگی مرۆڤ دێنێتەوە یەك ، نیوە تێر و نیوە برسیی ، نەبوونی یاسای ئیسلامە لە ناو کۆمەڵدا و مردنی ویژدانە بە لای ئەو دەوڵەمەندانەوە کە حیسابێ بۆ قیامەت ناکەن ..

بەلەمەوان لە سەر کاری خۆی بەردەوام بوو ، تا ئەوە بوو دوای ئەش ساڵە ، لە بەیانییەکی هاوینی بەغدادا ، لە سەر رۆخی راستی دیجلەدا ، واتە لە بەری کەرخەوە ، وەستا بوو ، سەیری کرد وا کچێك لەگەڵ دایکیا هاتنە لای ‥ تەمەنی کچەکە خۆی ئەدا لە شازە ساڵی ، لەوپەڕی شەنگ و شۆخیدا بوو ، لە هەموو بارەیەکەوە خوای گەورە لە جوانیی بەشی دابوو ‥ دایك و کچەی سواری بەلەمەکەی کرد و پەڕاندینەوە بۆ ئەوبەری رووبار بۆ بەشی روصافە ‥ هەر ئەوەندە بوو کە چاوی کەوت بە کچە ، هەر بە یەکەم بینین دڵی چووە سەری و شەیدای بوو ‥ یەکەم جاری بوو لە ژیانیا دڵی وەها لێ بدا بۆ ئافرەتێ ‥ بە راستیی کە دڵی لێی نەئەدا بۆ هیچ ئافرەتێ ناهەقی نەبوو ، چونکە بارێکی یەکجار قورس بە سەر شانیەوە بوو ‥ هەژاریی و خەمخواردنی بەخێوکردنی دایك و باوك و خوشك و براکانی دڵ و دەروونی ، داگیر کرد بوو ، بە رادەیەك خۆیشی وا بیری ئەکردەوە تازە دڵی بە یەکجاریی لە

هەست و سۆز کەوتووە و هیچ هەست و ئەستێك وەك نان و پەیداکردنی ناتوانن دڵی بێننە جۆش ..

جا هەر وەك ئەم دڵی جوولا و خۆشەویستیی کچەکەی تێ چوو ، لەو لاوە کچەکەش دڵی جوولا بۆ کوڕەکە .. وەك ئەم سەیری ئەوی ئەکرد ئەویش سەیری ئەمی ئەکرد ..

هەر چۆن بوو رووباریان بڕیی و کردیانە ئەو بەر بۆ لای چەپی دیجلە .. کاتێ ویستیان دا بەزن بە زەردەخەنەیەکی دڵڕفێنەوە سەیرێکی بەلەمەوانی کرد، کە خەریك بوو ئەم لە خۆشیی و شادمانیا بپوورێتەوە..

پەرینەوەی ئەم کچە لەگەڵ دایکیا هەموو هەفتەیەك دووبارە ئەبوویەوە و بەلەمەوان بۆی دەرکەوت بەیانیی هەموو پێنجشەممەیەك سەر لە پووری کچەکە ـ واتە خوشکی دایکی ـ ئەدەن ، بۆیە چاوەڕوانیی ئەکردن تا ئەهاتن و ئەی پەڕاندنەوە بۆ روصافە و دیسان چاوەڕوانیی ئەکردن تا ئەگەڕانەوە ، تا بیان پەڕێنێتەوە بۆ کەرخ.. کوڕە گەنجێکی پێ کەوتوو بوو،خاوەنی بالای

بەرز و بازۆڵەی ئەستوور و دەموچاوی گەشاوە و لێوی بەخەندە بوو ، ئەوەندە ڕێك و پێك و جوان و پێ کەوتوو بوو ، لە کوڕی هەزاری نەئەکرد ..

هەموو جارێ دایك و کچەکەی کە ئەهاتن و ئەگەڕانەوە و سواری بەلەمەکەی ئەم ئەبوون ، پارەیان بۆ نەکرت ، هەوڵی ئەدا پارەیان لێ وەر نەگرێ ، بەڵام دایکی کۆڵی نەئەدا و بە زۆر کرێی تەواوی ئەبڕیی بە سەریا ..ئەم نەویستن و بەزۆر پێدانە زیاتر خۆشەویستیی و ڕێزی خستبووە نێوانیانەوە و کەمە کەمە وت و وێژ لە نێوانیاندا دروست ئەبوو ، وەك سەلام و هەواڵ پرسینی تەندروستیی . جارێکیان لە کاتی دابەزینا کوڕە کە بینیی وا دایکی کچەکە لە پێشەوە دا بەزیی و کچەکە دوا کەوت ، بە هەلی زانی چپەیەك بدا بە گوێی کچەکەدا ، ئەوە بوو پێی وت : « پێم خۆشە مارەت بکەم » ..

کچەش هیچ لێی نەوەستا و وتی : « لە باوکم داوام بکە ، تا وەڵامت دەست کەوێتەوە » .

کچە و دایکی ڕۆیشتن بە ڕێی خۆیانەوە ، بەڵام وەڵامەکەی ئەوەی ئەگەیاند کە ناڕازیی نیە و لە هەمان کاتیشدا بە شوودانی بە دەستی باوکیەتی و پێویستە لەو داوا بکرێت ..

# ٣

کوڕە کەوتە بیر کردنەوە .. لە لایەکەوە خێزانەکەی هەژارە ، زۆر حەزیشی لە کچەیە و ژنهێنانیش پارەی ئەوێ ، کەوتە بیرکردنەوە : بە چ ڕێگایەك بتوانێ ئەمە بگەیەنێ بە دایك و باوکی وە بە چ شێوەیەك بیان هێنێتە سەر ڕێگا ، تا ڕازیی ببن ؟ چەند حەفتەیەك تێ پەڕیان کرد ، ئەو هەر لە بیر و ئەندێشەی خۆیا ئەژیا و لە دەریای داڵغە و لێكدانەوەدا نوقوم بوو بوو .. ڕۆژەکی ئەبردە ڕۆژەوە و یەکێکی ئەهێنایە دواوە ، لە نەگبەتیی ئەوا ، ئەوسا ئاواتەخواز بوو زوو زوو پێنجشەممە بێت و بە بینینی کچە بحەسێتەوە ، بەڵام ئێستا ئاواتەخوازە درەنگ تر پێنجشەممە بێت ، چونکە هەموو جارێ ئەم سەر و ئەو

سەر زامی دڵی ئەکوڵایەوە ، کاتێ کە کچەکە بە سەیرکردن گلەیی ئەکرد • خۆزگە بە دەم گلەیی بکردایە ? تا هیچ نەبێ وەڵامێکی بدابایەوە و کەمێ باری سووك بوایە ، نەکا بە چاو لۆمە بکا : بۆچی دیار یت و ئەمیش جگە لە خەم و شەرمەزاریی هیچی پێ نەکرێ ؟ بۆیە ئەوەندەی بۆ ئەمایەوە ، یان لە شەرما چاو دا خاوە یا لە بری سەیر کردنەکانیا زەردەخەنەیەکی بۆ بکا ••

تا ئەوە بوو بەیانیەکیان کچە چاندی بە ٔوێیا و وتی : « کەسێکی تر خەریکە داوام ئەکا » ئەمەی وت و چوو بە ڕێی خۆیەوە ، بەڵام ئەزنۆی وشك بوو بوو و هەنگاوی بۆ هەڵ نەئەگیرا ، لە شەرما هەناسەی سوار بوو بوو و لەوە زیاتر دوولێوەی بۆ نەئەکرا ، هەر وەك بڵێی تاوانێکی ئێجگار گەورەی کردبێ •

هەر چۆن بوو ، کوڕە ئەو ڕۆژەی بە داخ و مەراقەوە بردە سەر ؛ بەڵام چەند بیر و هەست هاتبێ بە دڵیا و چەند نەخشەی کێشابێ و سەرەنجامەکەی بە

هیچ دەر چوو بێ ، ئەویش لە بەر یەك هۆ : بێپارەیی ••
ئێوارە هات و گەڕایەوە ماڵەوە • زۆری لە خۆی کرد و پەردەی شەرمی لادا و باسەکەی بێڕایەوە بۆ دایکی • دایکیشمی بەڵێنی دایە بە زووترین کات وەڵامی بۆ بگەڕێنێتەوە •

دایکە چووە لای مێردەکەی ، جا چونکە وەزعی خۆیانی چاك ئەزانیی قسەی بۆ نەئەهات ، بە فرمێسك ڕژاندنەوە باسەکەی بۆ گێڕایەوە ••

دایکە ئەی زانی ماڵەکەی نە پۆشاکی تیایە و نە خۆراك ، ئەوەندە خاڵیە مشکیش پێ رازی نابێ • وە ئەیزانیی نە دیناریان هەیە و نە درهەم • خانووەکەیان بریتیی بوو لە تاقە ژوورێك کە هەر بە ناو ژوور بوو • چونکە نە سەرما و نە بارانی زستان ، وە نە گەرما و گڕەی هاوینی ئال نەئەدایەوە و رەشەبا لە هەموو کون و قوژبنێکەوە ، بێپرس ، خۆی ئەکرد بە ژوورا •
دایك و باوکی کوڕە زۆر بێخۆشحاڵ بوون بتوانن ژنێ پەیدا کەن بۆ کوڕی گەورە و ببێتە خاوەنی

ماڵ و خێزانی خۆی ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشا ژیان زانی داوای کوڕەکەیان جێ بە جێ ناکرێ و چەند هۆیەك بوونەتە کۆسپ لە بەردەمی ژنهێنانی کوڕەکەیانا • یەکێ لەوانە هەژاریی و بێدەستیی بوو ، ئەو هەژارییەی کە لە ڕیزەی خستبوون ••

دیارە ژنیش بە پارە دێ •• وە یەکێ تر لە کۆسپەکان بێجێگە و ڕێگەیی بوو ، کە ئەوان تافە ژووریکیان هەبوو و دیارە بووکیش ژووری تایبەتیی خۆی پێویستە •

وت و وێژی ژن و مێردە ، لە فرمێسك ڕێژان بەو لاوە ، هیچی تری لێ بە دەست نەهێنرا • وە دایکە بە دەستی خاڵیی و دەمی وەك تەڵەی تەقیو و چاوی ئەسرین ڕێژی بە وێنەی کانییەوە ، گەڕایەوە لای کوڕەکەی •

دایك فرمێسکی ڕێژا و دوو لێوەی پێ نەکرا ، تا کوڕەکەی تێ گەیەنێ • بەڵام کوڕە تێ گەیی ، جەرگی دایك و باوکی چۆن هەڵ ئەقرچێ بۆی و وا ناشتوانن

ئاواتی دڵی جێ بە جێ بکەن ، لە بەر ئەوە هەڵما و ڕۆی بە ڕێی خۆیەوە ..

دوای ماڵی باوکی پەنا بۆ لای کێ بەرێ ؟

بۆ لای خزم و خوێشان ؟

هەر کەسە بۆ خۆی خەریکی هەڵمەت و تەقەلایە و کێ بۆ کێ ئەپرسێتەوە ؟!

بۆ لای دەوڵەمەند و دەست ڕۆیشتوان ؟

کە پەروەردەی ئیسلامیی لە ئەو کۆمەڵە کز بوو ، کێ بەزەیی بە کێدا دێتەوە ؟ هەموو کەسێ بۆ بیرفانی خۆی هەوڵ ئەدا !

بۆ لای « بیت المال » ی موسـڵمانان ؟

کوڕە هیچی بۆ نەمایەوە جگە لە سەر کزکردن بە سەر ئیشەکەیەوە تا ئەوە بوو ڕۆژی پێنجشەممە هاتەوە ئەمجارە ، سەیرکردنی کچەکە ، زیاتر و بە تەندتر لۆمەی دەر ئەخست .. جا کە پێش خۆراوا بوون لە لای پووری گەڕایەوە پەڕاندیەوە بۆ لای کەرخ و بە دزەی دایکیەوە کەوتە شوێنی بەرەو ماڵەوەیان ،

ئافرەتەش بەینا و بەین ، تا بێتوانیایە ، ئاوڕی ئەدایەوە بۆ لای و هەموو ئاوڕدانەوەیەکیشی زەردەخەنەیەکی هەڵنانی لە گەڵا بوو .

کچە گەیشتەوە ماڵەوە .. چووە ماڵەوە و دڵی پڕ بوو لە متمانە کوڕی هەرزەکار ماڵەکەیان ئەزانێ و لەگەڵ کەس و کاریا دێنە لای باوکی بۆ خوازبێنیی . ئینجا بەر لەوەی دەرگاکە داخا، خواحافیزیی لێ کرد ..

بەتەما بوو بنێرێتە خوازبێنیی ، هەر دیار نەبوو . ماوەیەکی زۆر چاوەڕوان بوو ، کەچی بێهوودە بوو ، کچە تەواو بێتاقەت بوو و دەستی شۆریی ، هەر وەك کوڕە بێتاقەت بوو و دەستی شۆریی ..

کچە ئیتر ئەبێ بە تەمای چی بێ ؟ ئەو هەموو ماوەیە چاوەڕوانیی کرد بە بێ هوودە ..

لە هەمان کاتا ، کوڕەش سەیری کرد خۆی و خێزانەکەی هەژار و دەست کورت ، کچە و خێزانەکەشی دەوڵەمەند و دەسترۆیشتوو و ناودار ؟ بۆیە بیری کردەوە بە هیچ شێوەیەك توانای داواکردنی ئەوی نیە ،

هەرچەندە لە قووڵایی دڵیەوە خۆشی ئەزێت .. دوی ماوەیەك لە لایەكی ترەوە هاتنە خوازبێنیی كچە و بە خۆی و كەس‌وكاریەوە سەیریان كرد هاوەڵان و گونجاوە و بە رەزامەندیی هەموو لایەكیان ، بۆیان مارە كرد و گوازرایەوە ..

هەر ئەوەندە ئافرەتە كوڕەی ئەویست بۆ ئەوەی بە حەڵاڵی مارەی كا ، بە تایبەتیی كە ئەی بینیی ، لە پاڵ جوانیی و بێ‌كەوتنیا خاوەنی رەوشتێكی بەرز و زمانێكی شیرین و رووەتی گەشاوە بوو.. زور شانازی ئەكرد كوڕێكی وەها ، ئەگەر چی هەژاریش بوو ، مارەی كا و بە حەڵاڵیی ببنە هاوسەری یەك .. بەڵام كە نەی توانیی داوای بكا ، بگرە ئەو نەی زانی بێ ناتوانێ ، یا بڵێین ، دڵی پێوە نەبوو ، ئیتر وازی هێنا و شووی كرد بەوەی كە هاتە خوازبێنیی و بووە هاوشانی ئەو ، لە بەر چاوی خۆی و كەس و كاریا ئیتر كە شووی كرد ، وازی لە كوڕە بەلەمەوانەكە هێنا و بە جارێ لە بیری چۆوە . بەڵام بەلەمەوان دڵی كۆڵی

نـدا • وە بـە هیچ شێوەیەك نەیئەتوانی کچە لە بیری خۆی بەرێتەوە • شەو و ڕۆژ خۆی پێچ ئەدا ، چـــۆن هەژاریی دەستی بڕیی و نەی توانی هەڵبژاردەی دڵـی بخوازێ ؟ ئەمە بووە بیری مێشکی و هەمیشە لـە یادی نەئەچوو ، گەنجی بێکەس و بێسەر و شوێن ڕۆژ بە ڕۆژ مەراقی دڵی لە زیادکردنا بوو ، تا بووە رق و قین دوای ماوەیەك هەستی کرد کەوا کچەکە شـــــووی کردووە چونکە وەك جاران لەگەڵ دایکیا نەئەهات سەر لـە پووری بدات ، لە بەری ڕوصافە ••

جا کە ئەمەی زانیی ، ئیتر وەك جاران، چاوەڕوانیی نەئەکرد ، تا لەم سەر و لەو سـەرەوە کچـە و دایکی بەرێنێتـەوە • کوڕە دوو ساڵی بەسەرا تێ پەڕیین ، وای زانی دوو صـەدەیە •• خـەمبار ، مەلـوول ، مـات ، هەمیشە دڵتەنگ ، هەر لە بیری ئەو کچەدا بوو کە دڵی ڕاکیشا بوو و نەبوونیی و دەستکورتیی ، ئاوا قوڕ بـە سەریان کرد ••

ڕۆژێکیان دنیا بە تـەم و هەور دا پۆشـرا بوو ،

ئەوەی لە قەراغی دیجلەدا ئافرەتێك و منداڵێكی شیرەخۆری سواری بەلەم كرد ، تا بیان كاتە ئەو بەر . ژن و منداڵە لە ناو بەلەمدا دانیشتن و ئەمیش دەستی دایە سەوڵ لێدان و بەلەم لە بەری روصافە ، بەرە بەرە ، دوور كەوتەوە تا گەیشتە ناوەڕاستی رووبار ..

لە كاتێكا سەرگەرمی لێخوڕینی بەلەمەكەی بوو ، چاوی رووكا بە ئافرەتە و منداڵەكەیدا ، جوان سەرنجی دا ، بینی ئەوە ئەو كچەیە ، كە ئەم دوو ساڵ لەمەو بەر ، بە تەما بوو مارەی كا ، وە تێ گەیشت ئەم منداڵە بەریەوە ، هی خۆیەتی و لەو پیاوە بوویەتی ، كە شووی پێ كردووە .

شەیتان كوڕەی جوڵاند ..

افرەتەكە بەشۆكا بوو بە منداڵەكەیەوە . لە ناكاو بانگی لێ كرد و بیری خستەوە . بەڵام ئافرەتەكە ئەو رۆژانەی كە حەزی ئەكرد ئەم بە حەڵاڵی داوای بكا هەر لە یاد بوون .. وەڵامی دایەوە : « ئەمڕۆ من بە تەمای تۆ نیم و بۆ تۆ ناشێم ، من مێردم هەیە و ئەمەش

منالی خۆمە ، ..

بەڵام کوڕە ، شەیتان چڕو بووە بن کلێشی ، بۆیە هەر لە سەر بیری خراپە و نەشیاوی خۆی ئەڕۆیشت . مرۆڤ هەر ئەوەندەیە خوای لە بیر بچێتەوە و گوێ بە حەرام و حەڵاڵ نەدا ، گوێ بە حەیا و شەرەف نەدا ، ئیتر لە هیچ ناپرسێتەوە . کاری حەرامی خستە پێش چاوی و داوای لێ کرد ، بەڵام ئافرەتە شەرەفی خۆی پاراست .. هەڕەشەی لێ کرد بە خنکاندنی منالەکەی لە رووبارەکەدا ، هەر ملی پێ نەدا .. هەڵسا منالەکەی لە باوەشیا هەڵپڕووکاند و فڕێی دایە ناو ئاوەکەوە تا بە تەواویی چووە بن و رووبارەکە قووتی دا ، هەر شل نەبوو .. بە خەنجەرەکەی هەڵمەتی دایە سەری ،

وەك شێر لە بەر دەمیا بە بێ ترس وەستا .. بە خەنجەرەکەی دای گرتەوە و لە چەند لایەکەوە زامداری کرد ، لاوازیی نەنواند .. بە توندیی و بە بێ بەزەیی ـ بەو زامانەوە ـ رای کێشا تا پی نووسێنێ بە سنگیەوە ، هەر بەردەوام بەرگریی ئەکرد .. خوێنی زامەکانی

سەری کرد و چۆڕاوگەی بەست هێشتا هەر مەردانە خۆی نەدا بە دەستەوە !!

بەڵێ کچە زۆر حەزی ئەکرد بە حەلالیی ببێتە هاوسەری ئەو کوڕە ، سەیری دڵی پاکی خۆیی ئەکرد ، بەلام خوا خۆی چاك ئەزانێ هەموو دڵێك شایا ی چیە ..

ئەگەر ئەو کوڕە یەك تۆز وەفا و غیرەتی لا بوایە ، بە حەرامیی بیری لەو ئافرەتە نەئەکردەوە . وە کە خۆی نەدا بە دەستەوە ، ئەو منالە بێتاوانەی نەئەخنکاند . وە کە بۆی فریو نەدرا ، بە خەنجەر دای نەئەگرتەوە ، وە کە خوێناویی و زامداری کرد ، بە چ روویەکەوە هەوڵی ئەدا بی گوشێ بە خۆیەوە ؟

کە سەیری ژیانی ئەم کوڕە گەنجە ئەکەین وا خێزانێکی گەورە بەخێو ئەکا ، دەری ئەخا کە خاوەنی رەوشتێکی چاکە . ئەی بەرامبەر بەم ئافرەتە بۆ وایە ؟

ئەبێ لە یادمان بێ داوی ئافرەت زۆر بەهێزە ، وە هیچ رێگایەکی فریودان و لە خشتەبردن وەك ئافرەت کاریگەر نیە ، بۆ سەر پیاوان .. کوڕی گەنج بە تایبەتی

فریو درا کەوتە سەر بیری نیازی خراپ[1] •

ئافرەتە هەر لە سەر شەرەف و ناموسی خۆی بەرگریی کرد و خۆی نەدا بە دەستەوە ، هەتا دواهەناسەی ژیانی • هەر لە ناو بە لەمەکدا گیانی دەرچوو و بەلەمەش بووە گۆمی خوێنی بەناڕەوا ڕژراو و ئافرەتەی تێ کەوت •

کوڕە چونکە شەیتان مامۆستایەتیی ئەکرد ، هیچ خۆی تێك نەدا ئافرەتی کوژراوی هەڵ گرت و بە سپایی و بە بێ دەنگ فڕێی دایە ناو ئاوەکەوە و ئەویشی ڕاپێچ کرد •

ماوەتەوە سەر خوێنەکەی، هەڵمەتی دا بەلەمەکەی گەیاندە کەنارێکی چۆڵی دیجلە و ناوەکەی لە خوێن پاك کردەوە و بە بێ دەنگ خۆی لەو دوو کوشتنە ناڕەوایە

---

(١) ئەم ئامۆژگارییە بۆ خوشکانە بە وتەی ساختە نەخەڵەتێن •• زۆر کەس تەنها بە سەرزاریی خۆشەویستیی و پاکیی و دڵسۆزیی پیشان ئەدا • ئەوەی موسڵمانی خواناس نەبێ تەنها بیر لە بەرژەوەندیی خۆی ئەکاتەوە ••

رزگار کرد و یاسای سەرزەویش بە هیچ شێوەیەك پێی نەزانی !

هەر کەسە بە نیازی خۆی : ئافرەت و منداڵەکەی بوونە ستەم لێکراو و بەلەمەوانیش بووە ستەمکار ، تا لە رۆژی پاداش و تۆڵەدا ، هەر کەسە بە شێوێنی شیاوی خۆی بگات ..

تیاچوونی ئافرەت و منداڵەکە لە لایەن کەس و کار و میرییەوە سەری لێ نرایەوە و کەس نەی زانی تاوانبار کێیە ..

ناوانباریش ئەوەندە تاوانەکەی ناشیرین و نەشیاو و بێ هۆ بوو نەیتوانی زۆر لە سەر کارەکەی بەردەوام بێت .

هەرچی جارێ بە بەلەمەکەیەوە بگەیشتایەتە ناوەڕاستی رووبارەکە و لە نزیکی ئەو شوێنەوە تێپەڕی بکردایە ، کە ئەو تاوانەی کرد ، وا ئەهاتە پێش چاوی، ئەو منداڵەی کە لە رووبارەکەدا خنکاندی ، ئە ـری و

هاوار و دادیەتی • ئەو دەنگەی ئەکەوتەوە بەر گوێ ، لە کاتێکا کە بە زۆر ، لە باوەشی دایکەکەیا هەڵی پڕووکاند و ئەویش ئەگریا ، بەر لەوەی بیخاتە ناو ئاوەکەوە ••

وە دەنگی دایکی منداڵەکەشی ئەهاتە بەر گوێ ، کەوا هەڕەشە و هاوار لێ ئەکرد و بە سەدریا ئەی قیژاند •• وا ئەهاتە بیری ، ئافرەتە وا لە پەنای خوادا و هێرش ئەباتە سەر بەدنەمەکەی ، بەڵام چۆن هێرشێك ، بە رادەیەك شەپۆلی ئاوەکە بۆ [illegible]ریان و هاوار و دادی منداڵەکە و هەڕەشە و گوڕەشەی دایکی ، بەرز ئەبوویەوە •• خۆ کە شەویش بهاتایە بە سەرا ، هەرگیز بەدەمەوانی تاوانبار ، نەی ئەتوانی لە رووبارەکە بدا و بپەڕێتەوە ؟ چونکە تارمایی ئافرەت و منداڵەکەی ، لە تاریکاییا راویان ئەنا و ئەوەندە تارماییش ئەهاتن بۆ کۆمەکییان بە هیچ شێوەیەك لە ژمارە نەئەهاتن •

کورتەکەی بە دەست تاوانەکەیەوە ، ژیانی لێ تاڵ بوو بوو • ناچار وازی لەو کارەی هێنا و دەستی دایە

قسابیی ، دوای ئەوەی لە سەر گیان و خوێنی ئادەمیی خۆی را هێنا !!

## ٤

بەڵێ ، ئەوە بوو ، وەك لە پێشەوە باسمان کرد ، لە سەر کوژرانی پیاوێك کە نەی ئەزانی کێ کوشتوویەتی ، گیرا و درا بە دادگا .

لە دوایین شەوی ژیانیا ، دایك و باوك و خوشك و براکانی لە بەندیخانە ، لە گەڵیا کۆ بوونەوە ، تا بۆ دواجار ، چەند ساتێك لە گەڵیا دابنیشن و دوایین وت و وێژی لە گەڵا بکەن .

ئەو شەوە بە وردە هەموو شتێکی بۆ گێڕانەوە ، کە چۆن ئەو دایك و فرزەندە بەستەزمانەی لە ناو برد و کەس پێی نەزانی ، کەچی دوای ماوەیەك دەستی دادپەروەرانەی خوا ـ جل جلالە ـ رای کێشا تا کوشتنێکی تر بێتە گەردنی و بە ناوی ئەمەوە ، لە سەر دوانە پێشووەکە ، بدرێ لە سێدارە ..

کە رۆژ بوویەوە ، ماوەیەکی کەمی ما بوو بۆ لەسێدارەدانی ، چەند پیاوێکی میرییان هاتنە ژوورەوە لای و کەس و کارەکەشی هەر لەوێ بوون .. ئەم پیاوانە بۆ ئەوە هاتبوون تا دیمەنی لەسێدارەدانەکە بە چاوی خۆیان ببینن . دوای تەواوبوونی ماوە کەمەکە هەواڵیان درایە کەوا کاتی جێ بە جێ کردنی بڕیاری داد گا هاتووە ، هەرچی لەوێ ئامادە بوون بە جارێ ڕەنگیان پەڕی بوو .. چاویان زاق بوو بوو .. چی ئەبینن ؟ لەسێدارەدان ؟ مردن ؟ یاندەرچوون ؟ هەر یەکەیان ئاوات ئەخواست ، تەمەنی گەنجی جگەرگۆشەیان درێژ تر بوایە ، ئەگەر چی چەند خولەکێکیش بێت ..

ئەوەندەی پێ نەچوو هاتن و توورەکەیەکی رەشیان کرد بە سەریدا ، تادەم و چاوی داپۆشێ .

ئینجا پەلیان گرت و بەرەو پەتی سێدارە بردیان .. بەلەمەوانی تاوانبار ، برایە بەردەم پەتی سێدارە... سەر خرایە سەر تەختەدارەکە ، تا ملی بکاتە پەتەکە ..

پەتەکەیان خستە ملی ‥ بەڵام بەر لەوەی تەختەدارەکە لە ژێر پێیا لابەرن و پەتەکە لە ملیا توند بێتەوە ، بە دەنگی بەرز هاواری کرد :

« بگەڕێن بۆ ئەو کەسەی کە ئەم پیاوەی کوشتووە، من کە لە سێدارە ئەدرێم ، لە تۆڵەی منالە شیرەخۆرەکە و دایکیایە ؛ وە ئەو بڕیارەی بۆم دەرچووە لە داد و راستیی مرۆڤەوە نیە ، بەڵکو لە داد و راستیی خوای مرۆڤەوەیە » ‥

بەڵێ ، لەو کاتە ناسکەدا ، دانی نا بەوەدا کەوا بە لای خواوە مافی کەس نافەوتێ ، بە تایبەتیی مافی کوشتن ‥ ئەو کەسەی خوێن ئەڕێژێ ، با خرێنەکەی خۆیشی ئامادە کا بۆ رشتن ‥ کەس و کاری خوێن رێژانیش با خۆیان ئامادە کەن بۆ کۆستکەوتن و خوێنڕزانی ( پاڵەوانی ) خوێنرێژیان ‥ خوای گەورە بوونەوەری لە سەر راستیی وەستاندووە ‥

دوای تەواوکردنی شاهێدیەکەی تەختەداری ژێر پێی لا برا و پەتیش بە بێ رەحمانە ، وەك ـ بە فەرمانی

خوا ـ جل جلاله ـ تۆڵەی منالی ساوا و دایکی بێهانای بێتاوان بسێنێ ، خۆی ئاڵاندە ملی •

چەندێ ئەو هەی ویست ئافرەتی بەستەزمانی لاشە پڕ لە خەنجەر بگوشێت بە خۆیەوە ، گوایە ئەوین و خۆشەویستیە ، بەتیش وەها خۆی جیڕ کردەوە و بۆڕیی هەناسەی نەرم و شلی دا خست و هات و چۆی هەناسەی قەدەغە کرد ، تا (پاڵەوانی) بێبەزەیی بزانێ ، ئەوی ئازا و لێهاتوو ، توانای نیە لە چەند سائێك بەو لاوە بە بێ هەناسە بژی ••

بەڵێ ، گیانی دەر چوو و بەرەو دیوانی خوا کەوتە رێ و چیرۆکەکەشی هەر بە سەر زمانانەوە بوو ، بۆ پەند و ئامۆژگاریی ، ئەگێڕرایەوە •

١

ڕەوڕەوەی ژیان ئەڕوات و ئەستێرەکان هەر یەکە لە خولگەی خۆیاندا بە بڕیاری خوای گەورە ئەسووڕێنەوە .. خۆر و مانگ ، باو باران ، گیان لەبەر و ڕووەك .. هەر یەکە بە ئەرکی خۆی هەڵ ئەسێ بۆ هێنانە دی ژیان بۆ ئادەمیزادی ڕێز گیراو لە لایەن پەروەردگارەوە ..

ئادەمیەکانیش دوو دەستەن :

هەندێکیان ئەم بەخششانەیان لە بەر چاوە و سوپاسی خوا ئەکەن و ملی بەندایەتیی بۆ کەچ ئەکەن ، سەرەنجامیش بە سەربەرزیی هەردوو جیهان ئەگەن .. هەندێکیشیان کوێرانە ئەنیشنە مل و غیانێکی تازەلیی ئەدەنە سەر ، بێ ئەوەی بیر لە سەرەنجامی کردەوەی ناپەسندیان بکەنەوە ..

ژیان بە دوو ڕۆژی ئەم تەمەنە ئەزانن و هیچی تر ، بۆیە بە هەموو شێوەیەك هەوڵ ئەدەن بۆ ڕابواردن و گوێ نادەنە حەڵاڵ و حەرام ، چاك و خراپ ..

سەرەنجامیش رەنجەڕۆ و سەرگەردانی هەر دوو جیهان ئەبن •••

خانووی هەردووکیان بە یەکەوە نووسا بوو و جگە لە دیوارێکی نزم هیچی تر لە نێوانیاندا نەبوو ••
جا چەندە لە خانوو بەرەدا لە یەکەوە نزیك بوون، ئەوەندە و زیاتریش لەوە لە سروشت و هەلس و کەوتیانا جیا و لە یەکەوە دوور بوون ••
دراوسێ بوون بەلام رەفتار و بیر کردنەوە و ئامانجی ژیانیان یەك نەبوو ••

یەکەمیان هەلگری رێبازی خواناسیی و نوێنەری رۆشنایی بوو کە چەندێ ئاسمیی و دلڕفێنی و خێر و چاکەی تیایە ••

بە دل و بە گیان سەر و مالی تەرخان کرد بوو بۆ رەزامەندیی پەروەردگار •• بە راست و بە چەپا خزمەتی بەندەکانی خوای ئەکرد و بە هەموو بارێکا دەستی یارمەتیی بۆ درێژ ئەکردن تا بوو بووە خۆشەویستی هەموو ناسراوێکی و هەموو کەسێ ئازاتی بەرزیی و

سەرکەوتنی بۆ ئەخراست ..

بەڵام دووەمیان ڕێگەی سەرگەردانیی و نەگبەتیی گرتە بەر و بووە نوێنەری تاریکی کە چەندێ نەهاتیی و تەنگیی و خراپە و تاوانی تیایە . ئەم ڕەفتانەی بەرە بەرە ویژدان و جوامێریی لە دڵیا ئەخۆردەوە ، بەرە بەرە دڵەکەی ڕەش بوویەوە ، جا چونکە تاریک و ڕەش بوو ئەمەیتان هێلانەی تیا کرد ، تا هەڵنەری بێ بۆ هەموو تاوانێك ، تا خوای گەورەی لەبیر بەرێتەوە و بەو لەبیرچوونەوەیش لە چاك و خراپ نەپرسێتەوە و کوێرانە بنیشێتە مل ، وە لە هەمان کاتا هەر وەك خوای گەورەی سەرەجاند وەها بەندەکانیشی برەنجێنێ و ئازاریان بدات ..

هەر چۆن بێ تەمەنی هەردوکیان تەواو بوو ، هەر یەکەیان چووە شوێنی خۆی . بەڵام کە ئەوان خۆیان رۆیشتن دەنگ و باس و بیرەوەریان هەر ما . دانیشتوانی شاری مووسڵ هەرچی ناوی یەکەم بیستن و یادی بکەن رەحمەت بارانی ئەکەن و بە مامۆستا و سەرمەشقی

موسڵمانانی دا ئەڵێن ، کەچی دووەم مەگەر قسەی خراپ و نەفرینی بە شوێنا بڕوا • هەموو کەسێ بە دەسی خۆیەتی ، خوای گەورە ماوەی هەڵبژاردنی رێگای چاك و رێگای خراپی پێ بەخشیوە ، بۆیە کە شەیتانێکی کردووە بە هاوەڵی بۆ خۆشەویست کردنی خراپە و تاوان بە لایەوە ، لە هەمان کاتا فریشتەیەکیشی بۆ بڕیار داوە تا بەرە و چاکە و چاکەخوازیی هەڵی بنێ و ویژدانی بۆ چاکە ببزوێنێ و بۆ رەزامەندیی خوا ـ جل جلاله ـ بیخاتە رێ •

بەڵێ کۆچ کردنی هەر یەک لەو دوو دراوسێیە ، رۆژێکی دیار بوو بە لای دانیشتوانەوە و تا ئەمڕۆش هەر باس ئەکرێت • کورتەکەی چەمکێ لە مێژووی ئەو ناوچەیە بوو ، یەکێکیان لە جیاتی چاك ویستانی ناوچەکە و دووەمیشیان لە جیاتی خراپ ویستانی • تا بۆ هەموو کەسێ دەر کەوێ هەڵگرتنی رێبازی خوا وە یا رێبازی شەیتان بە پێی یاسایە • سەرەنجامی چاك ویستان ئاوا سەربەرزیی بە شوێنەوەیە و هی خراپ ویستانیش ئاوا

شەرمەزاریی و سەرشۆڕیی •

ئەو ڕۆژەی کە پیاوی چاکویست کۆچی تیا کرد ڕۆژی خەم و خەفەت و هەناسەهەڵکێشان و فرمێسکڕێژان بوو، ئەوانەی شوێن تەرمەکەی کەوتبوون بەوپەڕی دڵتەنگییەوە هەنگاویان هەڵ ئەگرت و لە دڵی خۆیانا ڕەحمەتیان بۆ داوا ئەکرد و هەر یەکەیان ئاواتەخواز بوو خۆیشی ئاوا پیاوچاك بوایە و ئەو ژیانەی کە خوا پێی بەخشیوە بۆ ڕازییکردنی خوای گەورەی تەرخان بکردایە •

بەڵێ ، دوور و نزیك و گەورە و بچووك کەوتنە شوێن تەرمەکەی جا لە کاتێکا کە دڵی هەموان ، بە کۆچکردنی زامدار بوو کەچی کۆڕ و شوێن کۆبوونەوەکانیان لێی چۆڵ نەبوون ، بەڵکو یاد و باس کردنی ئەو پیاوچاکە هەر بە سەر زمانانەوە بوو و مایەی بۆن خۆشکردنی هەموو شوێنێك بوو •

بەڵام ئەو ڕۆژەی دووەم کۆچی تیا کرد ڕۆژی خۆشیی و ئاهەنگ و دڵگەشانەوە بوو ، لە هەموو

لایەکەوە کۆ بوویەوە بە ئاوازی خۆش و وتنی « لا الە الا اللە » وە تا بەژداریی بینینی لەسێدارەدانی بکەن ٠٠ تا دڵیان ئاو بخواتەوە رزگاربوونیان لە دوو جەردەی خوێنمژ ٠٠ لە دوو مرۆڤی دڵرەشی بێویژدان ٠٠ لە دوو مرۆڤی زیانەخرۆ کە ژیانیان لە خەڵك تاڵ کرد بوو دوای ئەوەی شەرم و ترسی خوا لە دڵیانا نەما بوو ٠٠

بەڵێ هەر خۆی بەو ئەنجامە نالەبارە نەگەیشت : ئەنجامی ئابڕوو چوون و سەرنەوێڕیی و خەجاڵەتباریی و لەدەستدانی ژیان بە شێوەیەکی سووك ، بەڵکو ژنەکەیشی هەمان چارەنووس بەشی بوو ٠٠

تیاچوونی ئادەمیزاد زۆر سامناکە ٠٠ کوشتن و هەڵواسین لە بەر چاوانا هەر وا گاڵتە نیە ٠ ئەوانەی بە ناڕەوا ئەدرێن لە سێدارە تەنها خوێنمژان دڵیان بۆیان دا تا چڵەکێ و لەو رووداوە دڵتەزێنە باکیان نیە ٠٠ بەڵام کوشتن و هەڵواسینی جەردە و دڕندەکان ئۆخەی بە دڵی مرۆڤ ئەگەیەنێ ، بە تایبەتیی دوای بەکارهێنانی

هەموو ڕێگایەکی چاکەسازیی و کەڵك نەخواردیی ..
ئەو جۆرانە پێویستە هەوڵیان لە گەڵا بدرێ ، بەڵام کە
سوودی نەبوو ، میکرۆبن و ـ بە ناچاریی ـ لــە کۆڵ
ئەکرێنەوە پیاوی یەکەم ناوی حاجی خەططاب ئەحمەد
و دووەمیش ناوی عەببوود بوو ..

## ٢

حاجی خەططاب لە ژیانیا هەموو شتێکی بینیی ..
خۆشیی و ناخۆشیی .. دەوڵەمەندیی و هـەژاریی ..
ژیانی لــە هەر بار و دۆخێکدا بوایە ئەو هیچ خــۆی
تێك نەئەدا .. بە ڕاستیی و بە پاکیی دڵی بەسترا بوو بە
خواوە .. شەیدای ڕێبازی خواناسیی بوو بۆ پەروەردە
و پاككردنەوەی دڵەکەی ، تا تەنها خۆشەویستیی خــوای
تیا جێ بێتەوە ، بۆیە لە کاتی خۆشیی و هات و بووندا
سوپاسی خوای ئەکرد وە لە کاتی ناخۆشیی و نەهاتیی و
نەبوونیدا ئارامی ئەگرت .. خەریکی کڕین فرۆشتنی
مەڕ و ماڵات بوو لە نێوان مووسڵ و حەڵەبدا .. جاری
وایش ئەبوو درێژەی ئەدا بە گەشتەکەی و ئەگەیشــتە

ئەسکەندەرۆنەی شام و ئەسکەندەریەی میسر .

جا دوای ئەوەی لەوێ مەڕ و مالاَت و ولاَغەکەی ئەفرۆشت بە نرخەکەیان قوماش و صابونی ئەکڕیی و لە خاکی شام و میسرەوە ئەگەڕایەوە بۆ عێراق ..

بەلاَم هەر چەندە بە شێوەیەکی موسلَمانانە خەریکی کڕین و فرۆشتن بوو ، زۆر جار تووشی بێدەستیی و نەهاتیی ئەهات .. کەچی لە هەوڵ و کۆشش نەئەکەوت و دەستی سارد نەئەبووەوە . جارێکیان کۆمەڵە ولاَغێکی دایە بەر و لە مووسڵەوە بەرە و حەڵەب کەوتە رێ ، بە فەرمانی خوا لە رێگا مالاَتەکەی تووشیی نەخۆشیی و دەرد بوو و هەر هەموویان مردار بوونەوە ئەمیش بە دەستی خالَیی گەڕایەوە مالَەوە ، ئەوەندە بێدەست کەوت پاروویەك نانیشی شك نەئەبرد .

جارێکی تریش لە شامەوە بەرەو عێراق ئەگەڕایەوە ، لە رێگا جەردە رێیان پێگرت و هەرچی سامان و کەل و پەلێکی پێ بوو لێیان سەند .. ئەو جارەش هەر وا بە دەستی خالَیی گەڕایەوە مالَەوە .. بەلاَم ئەم رۆژە تا

ئەندازەیەکی زۆر گیانی خواناسیی لە ناو موسڵمانەکانـا ما بوو هەستیان بە برایەتیی ئەکرد و ئەچوون بە هانای برای لێقەوماویانەوە .. جا لە کاتێکا حاجی خەطاب بە خۆی و ماڵ و منالیەوە هیچیان شك نەئەبرد و ڕۆژانی ڕەش ڕوویان تێ کردبوون ، خەم و مـەراقێکی زۆر زۆریان هەبوو ، مەینەت و ئازار ڕووی تێ کردبوون هەر چەندە حاجی هەمیشە خەریکی سوپاسی خوا بوو و بە سوپاس و ڕەزامەندیی دەربڕین زمانی پاراو بوو بوو ، ئا لەو کاتەدا شەوێکیان تەقە درا لە دەرگا .. کە دەرگای کردەوە بینی پیاوێك لـە هاوەڵانـی پێی وت : بگرە !

حاجی ئەوەی درا بە دەستیەوە وەری گـرت .. دەسـتی لـێ دا تـا بزانێ چی بوو .. سـەیری کرد توورکەیەکی گەورەیە لە لیرەی ئاڵتوونی عوثمانیی .. کێ بوو ؟

نەی زانیی .. بۆیە بە پەلە توورەکە لیرەی فڕێ دایە زەویی و کەوتە شـوێن ئەو کەسـە تا بزانێ بـەم

تاریکە شەوە کێ بوو وا ئەم پیاوەتییەی لەگەڵ کرد .. تا بی‌ناسێ و لە سەر ئەو کردەوە چاکەی سوپاسی بکا ..
حاجی هەوڵی ئەدا بە هەر فێڵێك بووە فریای کابرا بکەوێ و ئەویش هەوڵی ئەدا بە هەر شێوەیەك بووە خۆی بپەڕێنێتەوە و کەس نەی‌ناسێ .. حاجی لە سەر ڕەوتی خۆی بەردەوام بوو ، کۆڵی نەدا ، هەتا گەیشتە لای پیاوەکە و دەبینێ پیاوێکی خێزانی ( آل الجمرد ) . بەر رەحمەتی بەلێشاوی خوا بکەوێ ..

دوای ئەوەی دڵی ئاوی خواردەوە بە ناسینی پیاوە، گەڕایەوە بۆ ماڵەوە و تورەکەکەی هەڵگرت و رۆیشتەوە بۆ ژوورەکەی خۆی و تورەکەکەی کردەوە سەیری کرد پێنج هەزار لیرەی ئاڵتوونی عوثمانیی تیایە ..

ئەو رۆژە پارە زۆر کەم بوو ، جا هەر کەسێ لەو رۆژەدا تەنها پێنج دانە لیرەی ببوایە نەك پێنج هەزار ، خەڵکیی بە دەوڵەمەندیان دا ئەنا ..

ئەبێ هەڵوێستی حاجی چۆن بوو بێ بەرامبەر بەو

پیاوە کە هەموو هەوڵێکی دا تا نەناسرێ و تەنها بەخشینەکەی لە بەر خوا بێ ؟ ئەبێ چەندێ کەلکی لەم هەڵوێستە مەردانەیە وەر گرتبێ ؟

بەڵێ ، پەروەردە بە کردەوە ئەکرێ .. بە بەخشین و دڵ گوشادیی و سەخاوەت ئەکرێت ..

حاجی بەرەو بازار کەوتە رێ مەڕ و ماڵاتی کڕی و بەرەو سووریا کەوتە رێ .. لەوێ قازانجێکی زۆری کــرد ..

ئینجا لــە سووریاوە قوماش و صابوونی هێنا و لەوێشدا قازانجێکی زۆری کرد ..

کاتێ گەڕایەوە قازانجەکە هاتە مشتی پەیمانی دا بە خوای گەورە لە سوپاسی ئەم بەخششەیدا هەرچی قازانج کردووە دا بەشی بکا بە سەر هـەژار و داماو و هەتیواندا ..

لەو گەشتەیدا زۆر زۆری قازانج کرد بوو ، هەر هەموو لە رێی خوادا بەخشیی بە هیــوای رەزامەندیی ئەو .. بەمە هەنگاوێکی زۆر گەورەی نا مەگەر موسڵمانە پێشینەکانی ئوممەتی ئیسلام ئەو هەنگاوەیان نابێت ..

## ٣

له کاتێکا حاجی خەططاب ، بە بوون و بە نەبوونی ، له خواپەرستیا تەمەنی ئەدایە سەر ، عەببوودی دراوسێی لـە تەمەنی لاویدا بوو ٠٠ ئەوەندە مرۆڤێکی دامەزراو نەبوو تا ژنێکی چاکی دەست کەوێ ، بۆیە تووشی بوو بە تووشی ئافرەتێکی نالەبارەوە ، کە بە هیچ شێوەیەك ترسی خوای نەئەهات بە بیرا ، بە هەموو شێوەیەك پیاوەی هەڵ ئەنا بۆ دزیی و وەدەست هێنانی پارەی حەرام ٠٠

ئافرەتی نەزان وای ئەزانی بەو جۆرە کارانە ژیان و ڕوزەرانیان خۆش ئەبێت ٠٠ نەك هەر ئەو بەڵکو هەموو ئافرەتێ ٠٠ هەموو مرۆڤێ کە ترسی خوا و ڕۆژی قیامەتی لە دڵانەبێ ، بە تەمایە بە هەڵپەی حەرام پێ بگا ، بێ ئاگایە لە هەڕەشەی پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ کەوا دەری ئەبڕێ هەر کەسێ هەر پارە و سامانێك لە ڕێگای ناشەرعییەوە پەیدا بکات ئەوا ئەگەر بێبەخشێ و زەکات

و خێری لێ دەرکا لێی وەر ناگیرێت ، وە ئەگەر دای نێ خوا فەڕ و پیرۆزیی تێ ناخا و فەوت و فەنا ئەبێت ، وە ئەگەر دوای خۆی بە جێی بێڵێ توێشوویەتی بۆ ناو ئاگر کە ئەفەرموێ :

« ... ولا يعجبنك امرؤ كسب مالا من حرام ، فانه ان انفقه وتصدق به لم يقبل منه ، وان تركه لم يبارك له فيه ، وان بقي منه شيء كان زاده الى النار » .

**رواه أبو داود**

ئافرەتی نەفام مێردی سەرگەردانی هەڵنا بۆ دزیی کردن و کۆکردنەوەی سامانی حەرام .. یەکەم جار بە هێلکە دزینی دراوسێیان دەستی پێ کرد ، ئینجا مریشك دزین .. دزیەکەی بەرە بەرە زیادی کرد تا گەیشتە دزینی کەل و پەل و پێویستی ناو ماڵ ، ئینجا بۆ بڕینی قاسە و دزینی ئاڵتوون و خشڵ ..

عەبوود ڕێگای شەیتانی گرتە بەر .. ڕۆژ بە ڕۆژ بەو ڕێگا سەختە پێچاوپێچە نالەبارەدا سەر ئەکەوت .. لە نەگبەتییا هەمەرو ڕۆژێ لە سەرکەوتنا بوو ..

یەکەم جار تەنها پشتی بە خۆی ئەبەست لە دزیی و تالآندا ، دوای ماوەیەك دەستەیەك دز و جەردە کەوتنە شوێنی و ئەم بووە سەرۆکیان ، تا بە هەموویانەوە نەخشەی جەردەیی و ڕێبڕین بکێشن و هەرچۆن پێیان خۆش بێت دەستدرێژیی بکەنە سەر بێتاوانان و بە شەودا هێرش بەرنە سەر ماڵان ..

ڕۆژێکیان عەبوود نەخشەی کێشا تا بە هەموویانەوە هەڵمەتێ بەرنە سەر ماڵی حاجی خەطابی دراوسێی و تالآنی بکەن .. دیارە ئەمەش بۆ ئەوان زۆر ئاسان بوو، چونکە تەنها دیوارێکی نزم لە نێوان خاوەکانیاندا هەبوو و هەر کاتێ بیان ویستایە زۆر بە ئاسانیی بەسەریا سەر ئەکەوتن ..

ئەمەش لە کاتێکا بوو کە حاجی تازە لە سووریا بە قازانجێکی زۆرەوە گەڕابوویەوە .. ئەوەندە زۆری قازانج کرد بوو باسی بە سەر هەموو زمانێکەوە بوو .. پێری دزانیش ئەمەیان بیست ، عەبوود بە هەلی زانی بەر لەوەی ئەم هەنگوینە بێ مێشەیان لە دەست دەر چێ

وا چ کە تەگبیری بکەن ، بۆیە بە پیاوەکانی وت : پێویستە بە پەلە دەست بگەیەنینە ماڵ و سامانەکەی حاجی خەططاب بەر لەوەی شپرزەی کا و بە سەر هەژاراندا بی بەخشێتەوە ..

٤

کاتێ عەببود و کۆمەڵەکەی ئەم تەگبیرەیان ئەکرد ، وەرز زستان بوو ، سەرما و سۆڵە تینی سەند بوو ، شەو بوو ، تاریکیی و زوقم لە یەکتر ئاڵا بوون..

دەنگیان نەکرد تا نیوەی شەو تێ پەڕیی ، ئەوسا لە دیوارە نزمەکەوە بێچربە خۆیان خستە ئەو دیو و چوونە سەر بان و خۆیان حەشار دا ، تا هەلیان بۆ هەڵ کەوێ و دابەزنە خوارەوە .. کەوتنە چاودێریی بزانن کەس ئاگادارە یا نا ..

عەببود خۆی چاوی خست بۆ حەوشەکە و سەیری کرد قەڵەبالغە .. سەرنجی دا ئەبینێ کۆمەڵە پیاوێ کۆڕیان بەستووە و بە گەردنی کەچ و بە ڕێك و پێکییەوە

خەریکی ذیکر و یادی خوان •

چاوەڕوانیی کرد تا بەشکوم ماندو بین و دەست هەڵ گرن ، کەچی لە شوێنی خۆیان هەڵ نەسان هەر خەریکی یادی خـرا بوون هەتـا بانگ‌وێژ دەستی دایە بانگ‌کردنی موسڵمانەکان بۆ نوێژی بەیانیی ••

ناچار بە بێ چرپە ، وەك چۆن هاتنە ئـەم دیو ، خۆیان هەڵ دایەوە بۆ ماڵی عەببوود و بڕیاریـان دا بۆ سبەی ئێوارە خۆیان ئامادە بکەنەوە و بێنەوە سەر ماڵی حاجی ••

بۆ شەوی دووەم هاتنەوە ، سـێیەم و چوارەم و پێنجەم و شەشەم و حەوتەم ، هەموو شەوێ کە ئەهاتن سەیریان ئەکرد قەڵەباڵغ لـە جاران زیاتـرە و کۆڕی خواناسان زیاتر بووە و لە سەر کاری پیرۆزیان بەردەوامن وە هەتا بانگی بەیانی دەست هەڵ ناگرن ••

لـە ئەنجاما هاتنە سەر ئەو بڕیارە دەست بەرداری ماڵی حاجی خەططاب بین ، چونکە کۆڕی قەڵەباڵغی ذیکر

و یادی خوا ڕێگایان نادا ئاواتەکانیان جێ بە جێ بکەن..

دوای مانگێك وەرزی سەرما و سۆڵە بە سەر چوو و وەرزی بەهاری رازاوە ، وەرزی گوڵ و گوڵزار ، وەرزی شیر و ماست و دۆ و کەرێ ، هاتە بەردوە .. بەڵێ ، بەهار بە خێر و فەڕ و بەرەکەتیەوە هات .. جـا لـە بەر ئەوەی حاجی خـەریکی کڕین و فرۆشـتنی مەڕومالآت بوو هەمیشە ئاژەڵی هەبوو و شـوانی بۆرا گیر کرد بوون ، کە بەهار هات و شیر و ماست و کەرێ زۆر بوو شوانەکان زۆرێ لە بەرهەمی ئاژەڵەکانیـان هێنا بۆ ماڵی حاجی و ئەمیش ـ خـوا پاداشتی چاکـەی بداتەوە ـ دەستی کرد بە بەخشینەوەی بەشێکی بە سەر دراوسێکاندا دیارە عەبوودین نزیکترین دراوسێیە و بەشی بەر کەوت ..

عەبوود وای بە چاك زانیی سەرێك لە ماڵی حاجی بدات بۆ دەر بڕینی سـوپاس و ڕێـزی بۆ دراوسـێی سنگ‌فراوان ..

دوای دانیشتن و بەخێرهاتن کردن ، قسـە قسـە و باس باس ، ئەوە بوو عەببوود پرسیاری کرد : ئـەرێ حاجی خەططاب ، ئایا هەمرو شەوێك لە مالّی خۆتانـا کۆڕی ذیکر کردن ئەبەسترێت ؟

حاجی وتی : لە مالّی ئێمەدا چەند سالێکە کـۆڕی ذیکر نەبەستراوە . عەببوود وتی : بەلاّم من بە چـاوی خۆم ەم کۆڕانەم بینیوە کە هەموو شەوێك لە شەوەکانی ئەم زستانەی کە بە سەر چوو لە مالّی ئێوەدا ەبەستران !

حاجی زۆر سەری ەوڕ ما بۆیە پرسیی : سبحان اللـە .. ئایا تۆ ەو کۆڕانەت بە چاوی خۆت بینیوە ؟!

عەببوود وتی : تا ئێستا راستیی دەر کەوت ..

ئینجا دەستی کرد بە گێڕانەوەی ئەو هەڕلانەی کە ئەو زستانە لەگەلّ کۆمەلەکەیا داویانە بۆ بڕینی مالّی حاجی و چۆن هەموو شەوێ کۆڕی یاد و ذیکر لـــە حەوشەکەیاندا تا بەرە بەیان ئەبەسترا و ئەوانیش بـە دەستی خالّیی ئەگەڕانەوە ..

حاجی کە ئەمەی لە عەببود بیست ، وتی : الحمد لله •• سوپاس بۆ خوا « ان الله یدافع عن الذین آمنوا •• » بەراستی خوای گەورە بەرگریی لە ئیمان داران ئەکات ••

عەببود کە زانیی ئەوەی ئەو بینیویەتی وا نەبووە تەنها ئەوەندە هەیە لە بەر چاوی ئەو و پیرەکەیدا ئەو کۆڕانە هەموو شەوێ دەر کەوتوون ، وەکو کەسێ شێت و لێوە بوو بێ ، خۆی پێ نەئەگیرا و هەر خەریکی وتنەوەی ئەم وتانە بوو : من بە چاوی خۆم کۆڕی ذیکرم بینی ؟ چۆن ؟!

بەڵێ ، ماڵی حاجی ئاگایان لە عەببود و دەستەکەی و تەگبیرەکەیان نەبوو ، وە ئەگەر خۆی باسی نەکردایە هەر نەیان ئەزانی ، لە ماڵی خۆیانا بێدەنگ دانیشتبوون، بەڵام خوای خاوەنی میهرەبانیی هەمیشە چاوی بەزەیی و ا اداریی لە بێتاوانانە ، نەك ماڵی حاجی ، بەڵکو هەموو ئیمانداریك خوا خۆی ئەیپارێزێ ••

پیر و دەستەی شەیتان زۆر بێویژدانن ، هەمیشە

خەریکی نانەوەی تەڵەن بۆ ئەوەی موسڵمان تووش بکەن ، زۆر جاریش موسڵمان ئاگای لێ نیە ، بەڵام خوای گەورە کە اگاداری هەموو نهێنییەکە خۆی بەرگریی لە موسڵمان ئەکا و ئەی پارێزێ ..

ئەو کاتانەش کە ستەمکاران بە سەر ئیمانداراندا زاڵ ئەبن هەتا لەو کاتانەشدا خوای گەورە ئیماندار ئەپارێزێ .. سەری ئەخا .. ئەگەر چی شەهیدیش بکرێ .. هەر پارێزراو و سەرکەوتووە ..

چونکە ستەمکار ئەیەوێ ئیمانەکەی لێ بسێنێ ، جا کە ئیماندار کوڵ نادا ، ئەوە سەرکەوتنە .. پارمەتییە .. پاراستنە !!

موسڵمان خوای بەسە کۆمەکی بێت ، بە تایبەتیی کەسێ دەست گرۆیی هەزاران و لێقەوماران بکات ..

٥

دوای ماوەیەك جەنگی جیهانی یەکەم (١٩١٤ - ١٩١٨ ) هاتە بەرەوە .. وڵاتە کافرەکان بۆ بەرژەوەندیی

خۆیـــان ئاگـری جـەنـگیان تـاو دا و ەلەچەوساوە دزاکـەتووەکانیـــان کــــردە پــــرد و بوونـــە ژێـر پێی لـەشـــکری خوانـەنـاسـا ـەوە •• بۆیـــە وڵاتی ئیسلامیش تووشی ناهەموارییی و نەبەتیی هات و گرانیی تیایا بڵاو بوویەوە •

نان دەست نەدەکەوت •• گەنم گران بوو ، بـە رادەیـەك نرخـی مەنێ گەنـم گەیشـتە لیرەیەك و تـا ئێستەش خەڵکیی ئەیڵێنەوە ، ساڵی مەن و لیرەکە ••

عەبوردین بەڵێ پارە و سامانی زۆری ئەهـاتـە مشت ، بەڵام چونکە بە حـەرامیی پەیدای کـرد بوو ، هەمووی لە رێگای عارەق و قومار و شەللاتیی ‌ریدا ، دانا و هیچی لـە مشتا نەما ••

بەڵێ داما •• برسیی بوو •• خێزانەکەی ، رۆژانی رەش ، بە گیری هێنا •• چی بکا باش بێ ؟

ئەو لە کاتی اسایی رۆژی رۆشندا عبوردی ەڵ ئەنا بۆ دزیی ، ئەبێ لە رۆژانی سەخت و ناهـەمواردا چی بـێ بکات ؟ بەڵـێ ، رێگایەکی زۆر نامەردانەی

خستە بەردەم مێردەکەی ، بۆ ئەوەی خۆیان ، لە برسێتیی ، رزگار کەن .. هەڵی نا تا ماڵی ساوا بدزێت و دوای سەربڕینیان گۆشتەکەیان بخۆن !!

هەر ئەوەندەیە مرۆڤ لە دین و ئیمان شۆڕایەوە .. ئیتر هیچ کارێك بە لایەوە بە خراپ ناژمێرێت .. هەتا دزینی کۆرپە و سەربڕینی !!

ئای کە دیمەنێکی جەرگ‌بڕە !

مرۆڤ هەر بە ناوبردنی مووی گرژ ئەبێت .. موچڕکەی پیا دێت .. کارێکی ناهەموارە .. ئەو کۆرپەیە ، بە چ حاڵێك بەخێو کرا بێ ، ئێستە وا ئەو ، چەقۆ ئەخاتە گەردنی ناسکیەوە ..

عەببوودی تاوابار ، لەگەڵ خێزانەکەیدا شوێن‌کەوتەی رێبازی ئەو دەروون‌ڕەشانە بوون ، کە ئاگری جەنگیان هەڵ‌گیرسان و ملیۆنەها رۆڵەی بێ‌تاوانی تیا فەوتا .. چ جیاوازیەکیان هەیە ؟ ستەم ، هەر ستەمە !!

بۆیە ئەبینین ، ئەوانەی جەنگ هەڵ ئەگیرسێنن و ئەبنە مایەی خوێن ڕژانی بێ‌تاوانان و ماڵ کاول‌بوونی

داماوان و جەرگ بڕینی دایك و باوكی قڕپەسەر و ، هەتیوخستنی منالی بێخانە و لانە و ، بێوەژن خستنی ئافرەتی بێنەوا لە كۆمەڵی دڕندەدا ؛ ئەوانە سەرەنجامیان هەر ئەبێ بە سووكیی و ڕیسوایی و هەناسەساردیی و سەرشۆڕیی دنیا و قیامەت بڕۆن .. بەڵێ ، ع بیوودیش ڕێگای ئەو جەردانەی گرتە بەر ..

ئەوان بۆ پاریزگاری كورسیی شەق و شڕیان و ئەمیش بۆ تێركردنی خۆی و خێزانەكەی .. چەند منالێكی فڕاند و دوای سەربڕین گۆشتەكەی خواردن..

دوای ماوەیەك پێی زانرا .. درا بە دادگا ..

دادگایش فەرمانی لەسێدارەدانی خۆی و ژنەكەی دەر كرد .. حكومەتی ئەو ڕۆژە بڕیاری دادگای بڵاو كردەوە، كە دەرهەق بە عەبیوود و ژنەكەی دەری كرد بوو .

ئینجا كات و شوێنی جێ بە جێ كردنی فەرمانی لەسێدارەدانەكەی دیاریی كرد و خەڵكیش لە هەموو كۆن و قوژبنێكەوە گرد بوونەوە و ، بەو پەڕی خۆشیی

و کامەرانییەوە لە شوێن و کاتی دیاریی کرازدا خۆیان ئامادە کرد بۆ بینینی دیمەنی لەسێدارەدانی تاوانباری خوێنمژ ..

بەڵێ عەبوود و ژنەکەی رۆیشتنە سەر شانۆی لەسێدارەدان . بە سەری شۆڕەوە وەستان و ئەو هەموو خەڵکەش تەماشای ئەکردن .. تەماشای جووتە تاوانبارێ ، کە وێنەیان ، بەو زاقییە ، زۆر کەمە .. وێنەیان هەیە ، بەڵام بۆ چاو بەست کردن پەردەیان کێشاوە بە سەر تاوانەکەیانا و هەموو کەسێ بە هاوشانی ئەوانیان نازانێ !!

خۆیان ئامادەی هەڵواسین کرد .. دەستیان لە ژیان شۆردی .. ئەو ژیانەی بە تەما بوون بە حەرام و دوور لە خواوە دەستیان کەوێ ،پێیان سەنرا ..ماوەی تەواو بوو .. مردن هاتە پێشەوە .. ئای لە مردن ، چۆن کەسێك لێی رزگار نابێت ..

بەڵام هەر چۆن بێ ، مردن دوو مردنە .. مردنی سەربەرزانە هەیە و مردنی سەرشۆڕانەیش هەیە ..

ئەم مردنەی عەبوود و ژنەکەی ، مردنێکی سەرشۆڕانە بوو .. جا ئەوە بوو هەموو خەڵکیی چاوی بڕیی بووە هەر دوو تاوانبارەکە ، تا چاویان لە هەڵواسینیان بێت . پێش لە سێدارەدانی ، بە عەبوود وترا :

دوایین ئاواتی ژیانت چیە با بۆت جێ بە جێ بکەین ؟

وتی : دوایین ئاواتی ژیانم ئەوەیە زمانی ژنەکەم ماچ کەم .. ئەو هەموو خەڵکە چاوەڕوانیی ئەکرد .. داوایەکی سەیرە .. مەبەستی چیە ؟ هەر چۆن بوو ، ژنەکەی زمانی دەر هێنا تا دوایین ئاواتی مێردەکەی بە ماچ‌کردنی بێتە دیی ، عەبوود هاتە پێشەوە .. هەموو خەڵکیش سەیریان ئەکرد ..

دەمی برد بۆ زمانی ژنەکەی لە سەرخۆ بە دەم گرتی .. بە بێ خۆ تێك دان بە ددانەکانی گرتی ..

دای توند کرد .. ژنه هاواری کرد .. زیاتر ددانی توند کرد .. زیاتر گوشیی .. ژنه هاواری بەرز بووینەوه .. ئامادەبووان دەنگ و ناڵەیان لێ بەرز بوویەوه .. عەببود کۆڵی نەدا .. دانی زۆر تیژ بوو .. چونکه بە تەگیری ژنەکەی گۆشتی کۆرپەی ساوای زۆری پێ خوارد بوو .. تا ئەهات قیژه و هاواری ژنە زیادی ئەکرد .. بەڵام عەببود بە تەواوەتیی ددانی گوشیی تا زمانی ژنەی قرتاند ..

جا عەببود وتی : بۆیە لە پێش مەرگی هەردووکماندا زمانم قرتاند ، چونکە هۆی نەگبەتییم زمانی ئەو بوو .. یەکەم جار بۆ تاوانی بچووك هەڵی نام ، ئینجا بەره بەره بۆ تاوانی گەوره ، تا بوومە تاوانبارێکی پڕمەترسیی .

جا ئەگەر سەرانسەری ژیانم هەر خراپە و تاوان بێت ، ئەوا قرتاندنی زمانی ژنەکەم بە دیار چاوی خەڵکەوه پەندی تیایە ، وه بەشکوم ئەو پەندە چاکە و قازانجی تیا بێ بۆ خەڵکیی ..

بەڵێ عەبوود دەرسێکی ئەو خەڵکە و هەمو وانەی کە چیرۆکەکەی ئەبیستن دا دا ، تا بزانن ، بە گوێکردنی هەر کەسێ کە خوانەناس بێ ئەوا سەرئەنجامی وا بە دواوە .. هەر بانگەواز و هەڵنانێك بۆ ڕەزامەندیی خوای گەورە نەبێ ، سەرەنجامەکەی پەشیمانییە ؟ ئەگەر چی بە ڕواڵەت خۆشیی و ڕابواردنی حەرامی ئەم ژیانەی تیا بە دیی بکرێت ..

دوای چەند ساتێك عەبوود و ژنەکەی سەرکەوتنە سەر کورسیی ژێر سێدارە و پەتەکە خرایە ملیان و بە دیار چاوی خەڵکەوە هەڵواسران و ئەوەندەی پێ نەچوو گیانیان دەر چوو و بە پەتی سێدارەکەوە وەك جۆلانە هات و چۆیان بوو ، تا پەند و ئامۆژگاریی بێ بۆ ئەوانەی خوایێداون ، وتەی چاك ئەبیستن و ، کەڵکی لێ وەر ئەگرن .

**وآخر دعوانا ان الحمد لله رب العالمين ..**

# ناوەڕۆك

## ئەم نامیلکەیە

- چوار چیرۆکی رووداوە و موسـلمانی ژیر دەسەڵاتی خوای گەورەی تیا بەدبی ئەکا و تێ ئەگا خوای گەورە بوونەوەری لە سەر یاسایەکی رەنگینی ریك و پێك دەستاندووە و ناڕەوایی تیایا قەدەغەیە ..
- دەری ئەخا ئەوانەی شەرمی خوا ناکەن و بە تاوان هەڵ ئەسن ، رۆژی تایبەتیی خۆیانیان بۆ دیاریی کراوە ، تا ریسوا بن و خەڵکیی پەندیان لێ وەر گرێ ..

نرخی « ٥٠٠ » فلسـە